




ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری هونەری: باسم رەسام

ناوی کتێب: کیمیاگەر

ناوی نووسەر: پاولۆ کۆیلۆ

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سیروان مەحمود

بابەت: ڕۆمان

نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٤

چاپخانە: پەنجەرە

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (٥٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٧٧٢)ـی ساڵی (٢٠١٤)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-976-6

ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:

Paulo Coelho, The Alchemist
Published by: Harper Collins, 2012

ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org●andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400





لەیادمە نامەیەکم لەبڵاوکەرەوەی ئەمەریکی، هارپەرکۆلینسەوە بۆ هات، کە نووسرابوو «خوێندنەوەی کیمیاگەر وەک ئەوە بوو لەشەبەقدا بەئاگابێیت و خۆرهەڵاتن ببینی، لەکاتێکدا هێشتا باقی جیهان لەخەودان.» چوومە دەرەوە و لەبیری خۆمدا گوتم، «کەوابە کتێبەکەم وەردەگێڕدرێ!» لەوکاتەدا، سەرەڕای ئەو هەموو دەنگەش، کە پێیان دەگوتم ئەوە کارێکی مەحاڵە، لەململانێی ئەوەدا بووم، وەک نووسەر بیگوزەرێنم و دوای ڕاڕەوی خۆم بکەوم.

وردەوردە خەونەکەم بووە واقع. دەیان، سەدان، هەزاران و ملیۆنان تیراژ لە ئەمریکا فرۆشران. ڕۆژێک ڕۆژنامەنووسێکی بەرازیلی تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی سەرۆک کلینتۆن لەکاتی خوێندنەوەی ئەو کتێبەدا وێنەی گیراوە. پاش ماوەیەک، کاتێ لە تورکیا بووم، گۆڤاری ڤانیتی فەیرم کردەوە و بینیم جولیا ڕۆبێرتس ڕایگەیاندووە، کە بەخوێندنەوەی کتێبەکە زۆر ئاسوودەبووە. بەتەنیا لەشەقامێکی مایامیدا دەڕۆیشتم و گوێم لەکچێک بوو بەدایکی دەگوت، «دەبێ کیمیاگەر بخوێنیتەوە!»

کتێبەکە بۆ ٧١ زمان وەرگێڕدرا، لەجیهاندا ٦٥ ملیۆن کۆپی لێفرۆشرا و خەڵکیش دەستیان بەپرسیارکردن کرد: «تۆ بڵێی ڤ نهێنییەک لەپشتی سەرکەوتنێکی ئاوها گەورەوە هەبێ؟» تاکە وەڵامی ڕاست ئەوەیە، کە خۆیشم نازانم. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە، کە هەر بەشێوەی سانتیاگۆی شوان، دەبێ ئاگاداری داستانی

تایبەتی خۆمان بین.

داستانی تایبەتی چییە؟ بەرەکەتی خودایە، ئەو ڕاپەڕەوەیە، کە خودا لەسەر زەوی بۆت هەڵدەبژێرێ. هەر کات شتێک دەکەین، کە پڕمان بکات لەپەرۆشی، دوای داستانی خۆمان دەکەوین. بەهەرحاڵ هەموومان غیرەتی ئەوەمان نییە ڕووبەڕووی خەونەکانمان ببینەوە. بۆ؟

لەبەر چوار تەنگوچەڵەمە. یەکەم، هەر لەمنداڵییەوە پێمان دەگوترێ، ئەوەی دەمانەوێت بیکەین مەحاڵە. بەم فیکرەیەوە گەورە دەبین، لەگەڵ زیادبوونی تەمەنیشدا، کینە و ترس و گوناهیش زیاد دەکەن. ئیدی کاتێ دێ، ئەو داستانە تایبەتییە لەقووڵایی ڕۆحماندا دەنێژرێ و دەبێتە شتێکی نادیار، بەڵام هێشتا بوونی هەیە.

ئەگەر ئازایەتی بەدووکەوتنی خەونەکەمان هەبێ، ئەوا ڕووبەڕووی دووەم ئاستەنگ دەبینەوە: خۆشەویستی. پێدەزانین چیمان گەرەکە، بەڵام دەترسین لەکاتی بەجێهێشتنی هەموو شتێک بۆ شوێنکەوتنی خەونەکەی خۆمان، کەسانی چواردەورمان ئازار بدەین. نازانین خۆشەویستی تەنیا تەوژمێکی بەهێزترە و ئەو کەسانەی بەڕاستی شادی ئێمەیان دەوێ، ئامادەن یاوەری گەشتەکەمان بکەن.

کاتێ خۆشەویستی وەک هاندەرێ قبوڵدەکەین، ڕووبەڕووی سێیەم کۆسپ دەبینەوە: ترسی بەرەنگاربوونەوەی ئەو شتانەی لەڕاپەڕەوەکەماندا تووشی دەبین. ئەوانەی لەپێناو خەونەکانیاندا دەجەنگن، بە نەهاتنەدی زۆر زیاتر ئازار دەچێژن، چونکە ئیدی ناتوانن پۆزشەکەی پێشوویان بەکاربێنن، «ئاهـ، نامەوێ ئەو شتە بەدی بێنم.» دەمانەوێ پێی بگەین و دەشزانین هەموو شتێکمان لەپێناویدا خستووەتە مەترسییەوە، سەرەڕای ئەوەش، کە تەواوی دڵیشمان لەگەشتەکەدایە، دەزانین ڕاپەڕەوی داستانە تایبەتییەکە لەهیچ







ڕێگەیەکی تر ئاسانتر نییە. لێ دەبێ ئێمەی جەنگاوەری ڕووناکی ئامادە بین لەساتە سەختەکاندا ئارام بگرین و بزانین گەردوون لەبەدیهێنانی خەونەکەماندا یارمەتیمان دەدات، گەر چی ناشزانین بە چ شێوەیەکە.

لەخۆم دەپرسم: ئایا بەزین گرنگە؟ باشە خۆ گرنگ بێ یا نا، هەر ڕوودەدات. کاتێ بۆ یەکەمجار دەست بەجەنگ دەکەین لەپێناو خەونەکانماندا، بێئەزموونین و چەندین هەڵە دەکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، نهێنی ژیان ئەوەیە، کە حەوتجار بکەویت و هەشتجار هەستیتەوە.

ئەی بۆ هێندە گرنگە دوای داستانی تایبەتی خۆت بکەوی، لەکاتێکدا خەڵکانی دیکە زیاتر ئازاری پێبچێژن؟ چونکە جارێک لەجاران بەسەر شتەکانماندا زاڵ بووین و هەمیشەش دەتوانین بەشێوەی ئەوجارە بین — ئێمە پڕین لەهەستێکی خۆشی و باوەڕێکی مەزنتر. لەبێدەنگی دڵماندا دەزانین، کە بەنرخیی خۆمان بۆ پەرجووی ژیان دەسەلمێنین. هەر ڕۆژ و هەر کاتژمێرێک بەشێکە لەجەنگە باشەکە. بەخۆشی و پەرۆشییەوە دەست بەژیان دەکەین. پەشۆکان و ئازاری چاوەڕواننەکراو، زۆر خێراتر لەو ئازارانە تێدەپەڕن، کە بەڕواڵەت هەمواردەکرێن؛ ئازارە ڕواڵەتییەکان بێ ئەوەی تێبینییان بکەین، بۆ چەندین ساڵ دەمێننەوە و وردە وردە ڕۆحمان دەخۆن، تا ئەو کاتەی وامان لێدێ ناتوانین خۆمان لەم تالاوە ئازاد بکەین و لەباقی ژیانماندا لەگەڵمان دەمێننەوە.

بەشوێنکەوتنی خەونەکانمان و بەکاربردنی تەواوی وزەی خۆشەویستیمان بۆ مەشقکردن لەسەری و ژیان لەگەڵ برینەکانمان بۆ ماوەی چەندین ساڵ، لەناکاو بۆمان دەردەکەوێ ئەوەی هەمیشە ئارەزوویمانکردووە لەبەردەمماندایە و چاوەڕێمان دەکات، ڕەنگە







هەر لەسبەیدا بێ. ئەوجا چوارەم تووشی دێتە پێشێ: ترسی بەواقعکردنی ئەو خەونەی تەواوی ژیانمان لەپێناویدا جەنگیوین.

ئۆسکار وایلد گوتوویەتی، «هەموو مرۆڤێ ئەو شتە دەکوژێ، کە ئارەزووی دەکات.» ئەوەیش وتەیەکی ڕاستە. ئەگەری ئاسان بەدیهێنانی ئەوەی گەرەکمانە، ڕۆحی مرۆڤی ئاسایی پڕدەکات لەتاوان. تەماشای ئەو کەسانەی چواردەورمان دەکەین، کە لەبەڕاستیکردنی حەزەکانیان شکستیان هێناوە و ئێمەش پێمان وایە شایانی ئەوە نین بەئارەزووەکانی خۆمان بگەین. لەیادی دەکەین بەسەر چەند تەنگوچەڵەمەیەکدا زاڵبووین، بەرگەی چ ئازارێکمان گرتووە و کۆڵمان لەچی داوە، تا بەئێرە گەیشتووین. چەندین خەڵک دەناسم، کە کاتێ داستانی خۆیان لەدەستدابووە، چەند هەڵەیەکی گەمژانەیان کردووە و هەرگیز نەیانتوانیوە بەئامانجەکەیان بگەن، گەرچی تەنیا هەنگاوێکیش لێوەی دووربوون.

ئەمە ترسناکترین ئاستەنگە، چونکە بەشێوەیەک لەشێوەکان، سیمایەکی پیرۆزی هەیە: دەستبەرداربوونی شادی و سەرکەوتن. بەڵام ئەگەر شایانی ئەوە بی، کە لەپێناویدا جەنگیویت، ئەوا دەبیتە ئامێرێکی خودا، یارمەتی ڕۆحی جیهان دەدەیت و تێدەگەیت بۆچی لێرەیت.




کوڕەکە ناوی سانتیاگۆ بوو. زەردەپەڕبوو کاتێ لەگەڵ مێگەلەکەی گەیشتە کڵێسە چۆڵەکە. ماوەیەکی زۆربوو بانەکەی ڕووخابوو، دارچنارێکی گەورەش لەشوێنی ژووری کەلوپەلە پیرۆزەکانی جاران هاتبووە دەرەوە.

بڕیاریدا ئەو شەوە لەوێ بەسەربەرێ. چاوەڕێیکرد تا هەموو مەڕەکان لەدەروازە وێرانەکەوە ڕۆیشتنە ژوورێ، پاشان هەندێک سێری دانا، تا مەڕەکان نەتوانن بەشەو بڕۆنە دەرێ. گورگ لەو هەرێمەدا نەبوو، بەڵام جارێک یەکێک لەئاژەڵەکان ونبووبوو و کوڕەکەش تەواوی ڕۆژی دواتری بەگەڕان بەدووی ئەو مەڕەدا بەسەربردبوو.

زەوییەکەی بە چاکەتەکەی سڕی و پاڵکەوت، ئەو کتێبەی وەک سەرین بەکارهێنا، کە تازە لەخوێندنەوەی تەواو بووبوو. بەخۆی گوت، کە دەبێ لەمەودوا کتێبی ئەستوورتر بخوێنێتەوە: درەنگتر تەواو دەبن و بەکارهێنانیشیان وەک سەرین ئاسوودەبەخشترە.

هێشتا تاریک بوو کاتێ بەئاگا هات، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و لەبنمیچە نیمچەڕووخاوەکەوە ئەستێرەکانی دەبینی.

لەبیری خۆیدا گوتی، دەمویست کەمێک زیاتر بخەوم. هەرهەمان خەونی هەفتەی پێشووی بینیبووەوە، جارێکی تریش بەر لەکۆتاییهاتنی خەونەکە، خەبەری بووبووەوە.

هەستا، گۆچانەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بەڕادانی ئەو مەڕانەی







هێشتا خەوتبوون. تێبینیکرد لەگەڵ خەبەربوونەوەی خۆیدا، زۆرینەی ئاژەڵەکانیش دەستیان بەجووڵە کرد. هەر دەتگوت وزەیەکی نهێنی ژیانی ئەمی بەهی مەڕەکانەوە بەستووەتەوە، ئەو مەڕانەی دوو ساڵی ڕابردووی لەگەڵدا بەسەربردبوون و بردوونی بۆ گوندەکان تا خواردن و ئاویان بۆ بدۆزێتەوە. بەبۆڵە گوتی، «هێندە پێم ڕاهاتوون، کە ڕەنگە بەخشتەی کارەکانم ئاشنا بووبن.» بۆ ساتێ بیری لەوە کردەوە و پێی وابوو، ڕەنگە بەپێچەوانەوە بێ: دەشێ ئەم بەخشتەی کارەکانی مەڕەکان ڕاهاتبێ.

چەند دانەیەکیان درەنگتر خەبەریان بووەوە. کوڕەکە گۆچانەکەی لەیەک بەیەکیانەوە ژەنی و هەر یەکەیانی بەناوی خۆیەوە بانگکرد. هەمیشە باوەڕی وابوو مەڕەکان لەقسەکانی تێبگەن. هەر بۆیە هەندێکجار ئەو بەشانەی کتێبەکانی بۆ دەخوێندنەوە، کە سەرنجی خۆییان ڕاکێشابوو، یان باسی ئەو تەنیایی و شادییەی بۆ دەکردن، کە شوان لەکێڵگەکاندا ڕووبەڕووی دەبێتەوە. هەندێکجار تێبینی لەسەر ئەو شتانە پێدەگوتن، کە لەو گوندانەی بەجێیهێشتبوون، بینیبوونی.

بەڵام لەو چەند ڕۆژەی دواییدا تەنیا باسی یەک شتی بۆیاندەکرد: کیژێک، کە کچی بازرگانێکە و لەو گوندە دەژی، کە ئەوان لەنزیکەی چوار ڕۆژدا دەیگەیشتنێ. تەنیا یەکجار بۆ ئەو گوندە ڕۆیشتبوو، ئەویش ساڵی ڕابردوو بوو. بازرگانەکە سەرکاری دوکانێکی وشکە بوو، هەمیشە داوایدەکرد مەڕەکان لەبەردەمی خۆیدا ببڕدرێنەوە، بەو شێوەیەش بوار نەدەبوو فێڵی لێبکرێ. هاوڕێیەک باسی ئەو دوکانەی بۆ کوڕەکە کردبوو، ئەویش مەڕەکانی بردبوو بۆ ئەوێ.









کوڕەکـە بەبازرگانەکـەی گـوت، «دەمـەوێ هەندێـک خـووری بفرۆشـم.»

دوکانەکـە جەنجاڵبـوو و بازرگانەکـەش داوای لەکوڕەکـە کـرد تـا پاشـنیوەڕۆ چاوەڕێبـکا. بـەو شـێوەیەش کوڕەکـە لەنزیـک دوکانەکـە دانیشـت و کتێبێکـی لەجانتاکـەی دەرهێنـا.

دەنگـی کچێـک لەپشـتییەوە گوتـی، «نەمدەزانـی شـوانەکانیش خوێندەوارییـان هەیـە.»

کچەکە لەهەرێمـی ئەندەلوسـیادا نموونەیـی بـوو، خـاوەن قژێکـی خاو و جووتێـک چـاو بـوو، کـە بەشـێوەیەکی ئاڵـۆز داگیـرکارە موورەکانـی بیردەخستەوە.

کوڕەکـە لەوەڵامـدا گوتـی، «بـەڵام ئەوەنـدەی لەمـەڕەکان فێردەبـم، لەکتێبەکانـەوە فێـر نابـم.» لەماوەی ئـەو دوو کاتژمێرەی قسـەیاندەکرد، کیژەکـە پێـی گـوت، کـە کچـی بازرگانەکەیـە و باسـی ژیانـی گوندەکـەی بـۆ کـرد، کـە هەمـوو ڕۆژەکان تێیـدا چوونیەکـن. کوڕەکـە باسـی لادێکانـی ئەندەلوسـیای بـۆ کـرد و هەواڵـی ئـەو شـارۆچکانەی پێدا، کـە سـەردانی کردبـوون. گۆڕانکارییەکـی سـەرنجڕاکێش بـوو، لەقسـەکردن لەگـەڵ مەڕەکانـەوە بـۆ ئـەم شـێوە گفتوگۆیـە.

کچەکە پرسی، «چۆن فێری خوێندەواری بوویت؟»

گوتی، «وەک هەموو کەسێکی تر، لەخوێندنگە.»

«ئەی ئەگەر خوێندەوارییت هەیە، بۆچی شوانی دەکەیت؟»

لەبەرخۆیـەوە وەڵامێکـی بۆڵانـد، کـە بـووە هـۆی ئـەوەی خـۆی لەپرسـیارەکە بدزێتـەوە. دڵنیابـوو لـەوەی هەرگیـز کچەکـە تێنەدەگەیشـت. لەسـەر گێڕانـەوەی چیرۆکـی گەشـتەکانی بەردەوامبـوو و چاوە موورییەکانـی ئەویـش، پـڕ لەتـرس و حەپەسـان دەبـوون. لەگـەڵ







تێپەڕینی کاتدا، کوڕەکە حەزیکرد هەرگیز ئەو ماوەیە کۆتایی نەیەت، دەیویست باوکی کچەکە سەرقاڵ بێ و بۆ ماوەی سێ ڕۆژان کوڕەکە لەویا بهێڵێتەوە. بۆیەدەرکەوت هەست بەشتێک دەکا، کە هەرگیز ئەزموونی نەکردووە: خواستی ژیانی هەتاهەتایی لەیەک شوێندا. لەگەڵ ئەو کچە پرچ قاژووە، هەرگیز ڕۆژەکانی دووبارە نەدەبوون.

بەلام لەکۆتاییدا بازرگانەکە دەرکەوت و داوای لەکوڕەکە کرد چوار مەڕان ببڕێتەوە. پارەی بەکوڕەکەدا و داوای لێکرد ساڵی داهاتووش بگەڕێتەوە.



ئێستاش تەنیا چوار ڕۆژی مابوو بگەڕێتەوە بۆ هەمان گوند. چالاک و لەهەمان کاتیشدا نائاسوودە بوو، ڕەنگە کچەکە ئەوی لەیادکردبێ. چەندین شوان بەوێدا تێپەڕیون و خووریان فرۆشتووە.

بە مەڕەکانی گوت، «گرنگ نییە، کچی تر لەشوێنی دیکە دەناسم.»

بەلام لەناخەوە دەیزانی بەلایەوە گرنگە. دەشیزانی شوانەکان، هەر بەشێوەی دەریاوان و دەستگێڕەکان، هەمیشە شارۆچکەیەک دەدۆزنەوە، کە کەسێکی ئەوێ وایان لێدەکات شادی گەڕانە بێباکەکانیان لەیادبکەن.

کازیوە بوو، شوانەکە مەڕەکانی بەرەو ئاراستەی خۆرەکە بەڕێدەکرد. لەبیری خۆیدا گوتی، ئەوان هەرگیز پێویستیان بەبڕیاردان نییە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێ هەمیشە لەنزیک من دەمێننەوە.

تاکە شتێ کە بۆ مەڕەکان گرنگ بوو، خواردن و ئاو بوو.






هەتا کوڕەکە بیتوانیبا لەوەڕگەی باش بدۆزێتەوە، مەڕەکان هاوڕێی ئەو بوون. بەڵام، ڕۆژەکانیان هەر بەهەمان شێوە بوون، لەگەڵ کاژێرە بەرواڵەت ناکۆتاکانی نێوان خۆرهەڵاتن و زەردەپەڕدا؛ هەرگیز لەتەمەنی لاویشیاندا کتێبێکیان نەخوێندووەتەوە، هەروەها لەوەش نەیاندەگەیشتن، کە کوڕەکە باسی دیمەنی شارەکانی بۆ دەکردن. تەنیا بەخواردن و ئاو قایل بوون، لەبەرامبەریشدا، میهرەبانانە خوورییەکەیان، هاوەڵییان و — جار جارەش — گۆشتەکەیانیان دەبەخشی.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ئەگەر ئەمڕۆ ببم بەدڕندە و بڕیاربدەم یەک بەیەکی مەڕەکان بکوژم، تەنیا ئەو کاتە پێی دەزانن، کە زۆرینەی ڕانەمەڕەکە سەردەبڕم. ئەوان باوەڕم پێدەکەن و لەیادیانکردووە چۆن پشت بەخۆیان ببەستن، چونکە من بۆ دۆزینەوەی خواردن ڕابەرییان دەکەم.

کوڕەکە سەری لەبیرۆکەکانی خۆی سوڕمابوو. ڕەنگە ئەو کڵێسەیەی دارچنارەکەی تێدا گەورە بووە، خێوی تێدا بێ. وای لەکوڕەکە کرد بۆ جاری دووەم هەمان خەون ببینێتەوە و بەرامبەر هاوڕێ دڵسۆزەکانی هەست بەتووڕەبوون بکات. کەمێکی لەو شەرابەی خواردەوە، کە لەئێوارەخوانی شەوی پێشووی مابووە و چاکەتەکەی لەنزیک خۆیەوە کۆکردەوە. دەیزانی چەند کاتژمێرێکی تر خۆر دەچێتە ناوەڕاستی ئاسمان و هێندە گەرم دەبێ، کە ئیدی ناتوانێ مێگەلەکەی بەرەو کێڵگەکان بەرێ. ئەمە ئەو کاتژمێرەی ڕۆژە، کە تەواوی ئیسپانیا لەوەرزی هاویندا دەخەون. گەرماکە تا شەو دەخایەنێ و دەشبێ تەواوی ئەو ماوەیە چاکەتەکەی هەڵبگرێ. کاتێ دەستیکرد بەگلەییکردن لەسەر ئەو بارە قورسەی، بیری کەوتەوە لەبەر چاکەتەکەیە، کە دەتوانێ بەرگەی سەرمای زەردەپەڕ بگرێ.







لەبیری خۆیدا گوتی، دەبێ ئامادەی گۆڕانکاری بێت. ئەیجا بەقورسی و گەرمی چاکەتەکەی شادمان بوو.

چاکەتەکەی ئامانجێکی هەبوو، کوڕەکەش بەهەمان شێوە. ئامانجی کوڕەکە گەشتکردن بوو، پاش دوو ساڵ ڕۆیشتن بەناوچەی ئەندەلوسیادا، تەواوی شارەکانی هەرێمەکە شارەزا ببووبوو. تیایدا لەسەردانەکەیدا بۆ کچەکەی ڕوونیکاتەوە، کە چۆن شوانێکی ساکار دەتوانێ بخوێنێتەوە. هەتا تەمەنی شانزە ساڵی لەکۆلێژی کاسۆلیکدا خوێندوویەتی. دایک و باوکی دەیانویست ببێتە قەشە بەو شێوەیەش دەبووە سەرچاوەی شانازی خێزانێکی جووتیار هەر بەشێوەی مەڕەکان، بۆ پەیداکردنی خۆراک و ئاو کاری زەحمەتیان دەکرد. ئیسپانی و لاتینی و ئایینزانی خوێندبوو. هەر لەمنداڵییەوە دەیویست شارەزای جیهان بێ، ئەوەش بۆ ئەو لە لەوە گرنگتر بوو، کە خودا بناسێ و فێری گوناهەکانی مرۆڤ ببێ. پاشنیوەڕۆیەک، لەسەردانێکیدا بۆلای خێزانەکەی، غیرەتی دایە بەرخۆی، تا بەباوکی بڵێ نایەوێ ببێتە قەشە. دەیەوێ گەشت بکات.



باوکی گوتی، «لە تەواوی جیهانەوە خەڵک هاتوون و بەناو ئەم گوندەدا تێپەڕیوون. هاتوون بۆ شوێنی نوێ بگەڕێن، بەڵام کاتێ ڕۆیشتوون، زۆر بەسادەیی هەر ئەو کەسانە بوون، کە پێشتر گەیشتبوونە ئێرە. بەچیاکاندا سەرکەوتوون، تا کۆشکەکە ببینن. پێشیان وابوو ڕابردوو باشترە لەوەی ئێستا هەمانە. ئەوان خەڵکانی قژزەرد، یان پێستڕەش بوون، بەڵام لەڕاستیدا هەر وەک ئەو







کەسانەن، کە لێرە دەژین.»

کوڕەکە گوتی، «بەڵام دەمەوێ قەڵای ئەو شوێنانە ببینم، کە ئەوان لێی دەژین.»

باوکی بەردەوام بوو، «ئەو خەڵکەی زەوییەکەی ئێمە دەبینن، دەڵێن حەز دەکەن بۆ هەتاهەتایە لێرە بژین.»

کوڕەکە گوتی، «بەڵام منیش دەمەوێ زەوییەکانی ئەوان ببینم و بزانم چۆن دەژین.»

باوکی گوتی، «ئەوانەی دێنە ئێرە، پارەیەکی باشیان هەیە و دەتوانن گەشت بکەن. لەناو ئێمەدا، تەنیا شوانەکان توانای گەشتکردنیان هەیە.»

«کەواتە منیش دەبم بەشوان.»

باوکی هیچی تری نەگوت. ڕۆژی دواتر جانتایەکی دایە، کە سێ کۆینی دێرینی ئاڵتوونی تێدابوو.

«ئەمانەم لەکێڵگەکاندا دۆزییەوە. دەمویست ببن بەبەشێک لەمیراتییەکەت. بەڵام مێگەلێکی پێبکڕە. بڕۆرە کێڵگەکان، ڕۆژێکیش بۆت دەردەکەوێ، کە گوندەکەی ئێمە باشترینە، ژنەکانیشمان جوانترینن.»

ئەوجا نزای خێری بۆ کوڕەکە کرد. کوڕەکە لەڕامانی باوکیدا ئارەزووی ئەوەی بەدیکرد، کە خۆی بتوانێ گەشت بەجیهاندا بکات — ئارەزوویەک، کە هێشتا بوونی هەبوو، بەڵام دەبوو لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا و لەژێر باری ململانێدا بۆ ئاو و خواردن، بۆ شوێنێک، کە بتوانێ شەوی تێدا بکاتەوە، بنێژێت.







ئاسۆ سووربوو و لەناکاو خۆرەکە دەرکەوت. کوڕەکە گفتوگۆکەی نێوان خۆی و باوکی بیرکەوتەوە و هەستی بەشادی کرد؛ ئێستا چەندین کۆشکی بینیووە و چاوی بەچەندین ئافرەت کەوتووە (بەڵام هیچیان ناگەنەوە بەوەی لەچەند ڕۆژی داهاتوودا چاوی پێی دەکەوت). خاوەنی چاکەتێک، کتێبێک، کە دەیتوانی لەگەڵ دانەیەکی تردا بیگۆڕێتەوە، ڕانەمەڕێک بوو. بەڵام گرنگترین شت ئەوە بوو، کە هەموو ڕۆژێک دەیتوانی خەونەکەی بەدی بێنێ.

ئەگەر ڕۆژێک لەڕۆژان لەکێڵگەکانی ئەندەلوسیا بێزار ببایە، دەیتوانی بڕوا بۆ دەریا. لەو کاتەشدا دەریا بۆ ئەو بەس بوو، چونکە بەشاری دیکە ئاشنا دەبوو، چاوی بەژنی دیکە دەکەوت و بواری دیکەی بۆ شادمانی دەبوو. کاتێ تەماشای خۆرهەڵاتنی کرد، لەبیری خۆیدا گوتی، نەمتوانی خودا لەخوێندنگەی کاسۆلیکدا بدۆزمەوە.

هەرکات بیتوانیبا، ڕێگەیەکی تری بۆ گەشتکردن دەدۆزیەوە. پێشتر هەرگیز نەچووبووە کڵێسە ڕووخاوەکەوە، لەقینی ئەوەی چەندینجار بەو ناوچانەدا گەشتیکردبوو. جیهان گەورە و نەبڕاوەیە؛ دەبوو ماوەیەک ڕێگەی بدابا مەڕەکان ڕاڕەوی خۆیان هەڵبژێرن، بەو شێوەیەش شتی بایەخداری دیکەی دەدۆزیەوە. کێشەکە ئەوەیە مەڕەکان تەنانەت بەوەش نازانن، کە هەموو ڕۆژێک ڕاڕەوێکی نوێ دەگرنە بەر. نابینن کێڵگەکان نوێن و وەرزەکان دەگۆڕێن. هەموو ئەوەی بیری لێدەکەنەوە، خواردن و ئاوە.

کوڕەکە ڕاما، ڕەنگە هەموومان هەر بەهەمان شێوە بین. تەنانەت منیش — لەو کاتەوەی چاوم بەکچی بازرگانەکە کەوتووە، بیرم لەهیچ کیژێکی تر نەکردووەتەوە. تەماشای خۆرەکەی کرد و بۆیدەرکەوت بەر لەنیوەڕۆ دەگاتە تاریفە. لەوێ دەیتوانی کتێبەکەی







پەیانەیەکی ئەستوورتر بگۆڕێتەوە، بتڵی شەرابەکەی پڕ بکاتەوە، ریشی بتاشی و قژی چاک بکات؛ دەبێ خۆی بۆ بینینی کچەکە ئامادە بکات، نەشی دەویست بیر لەو ئەگەرە بکاتەوە، کە شوانێکی تر بە مێگەلێکی گەورەترەوە گەیشتبێتە ئەوێ و داوای هاوسەرگیری لێکردبێ.

تەماشای ئاراستەی خۆرەکەی کردەوە، هەنگاوەکانی خێراکردن و لەبەری خۆیدا گوتی، شیاوە خەونێک ببێتە ڕاستی و ژیانێک پڕبایەخ بکات. لەناکاو بیریکەوتەوە، کە لەتاریفە ژنێکی لێیە و دەتوانێ خەون لێکبداتەوە.



پیرەژنەکە کوڕەکەی بەرەو ژوورێکی پشتەوەی خانووەکەی برد؛ بەپەردەیەکی بەمووورووی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشراو لەژووری میوانەکە جیا کرابووەوە. کەلوپەلی ژوورەکە پێک هاتبوو لەمێزێک، وێنەیەکی دڵی پیرۆزی عیسا و دوو کورسی.

ژنەکە دانیشت و داوای لەکوڕەکەش کرد لەسەر کورسییەکە دابنیشێ. ئەوجا ژنەکە دەستەکانی کوڕەکەی لەدەستی خۆیدا گرت و دەستی بەنزاخوێندن کرد.

لە نزای قەرەجێک دەچوو. کوڕەکە خۆی ئەزموونی لەگەڵ قەرەجەکانی شەقامدا هەبوو؛ ئەوانیش گەشتیاندەکرد، بەڵام ئەوان ڕانەمەڕیان نەبوو. خەڵکی دەڵێن قەرەجەکان ژیانیان بەفێڵکردن لەخەڵکانی تر بەسەر دەبەن. دەشڵێن پەیمانیان لەگەڵ ئەهریمەن هەیە، کە گوایا منداڵ دەفڕێنن، دەیانبەن بۆ چادرگە نهێنییەکانیان و دەیانکەن بەکۆیلەی خۆیان. بەمنداڵی، هەمیشە کوڕەکە تا ڕادەی





مردن لەوە دەترسا قەرەجەکان بیگرن، کاتێکیش ژنەکە دەستەکانی ئەوی لەدەستی خۆیدا گرت، ئەو ترسەی منداڵیی بۆ گەڕایەوە.

بەڵام ئەو وێنەی دڵی پیرۆزی عیسای هەیە، لەبیری خۆیدا ئەوەی گوت. دەیویست خۆی دڵنیا بکاتەوە. نەیدەویست دەستەکانی بکەونە لەرزە و پیشانی ژنەکەی بدات ئەو کەسێکی ترسنۆکە. بەهێواشی نزای باوکی ئێمەی دەخوێند.

ژنەکە گوتی، «زۆر نایابە.» هەر چاوی لەسەر دەستەکانی کوڕەکە لانەدەبرد و پاشان بێدەنگ بووەوە.

خەریکبوو کوڕەکە دەشڵەژا. دەستەکانی کەوتنە لەرزە و ژنەکەش پێی زانی. خێرا دەستەکانی ڕاکێشا.

پەشیمانبوو لەوەی هاتبوو و گوتی، «نەهاتووم دەستم بۆ بگریتەوە.» بۆ ساتێک بیری لەوە کردەوە پارەکەی بدا و بێ ئەوەی گوێ بیستی هیچ شتێ بێ بڕوات، زۆر گرنگی بەخەونە دووبارەکەی دەدا.

پیرەژنەکە گوتی، «تۆ هاتوویت تا خەونەکەت بۆ لێک بدەمەوە. خەونیش زمانی خودایە. کاتێ بەزمانی ئێمە دەدوێ، دەتوانم لێکی بدەمەوە. بەڵام ئەگەر بەزمانی ڕۆح قسە بکات، ئەوا تەنیا خۆت لێی تێدەگەیت. بەڵام هەر کامێکیان بێت، پارەی ڕاوێژەکانمت لێدەسەنم.»

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، فێڵێکی تر. بەڵام بڕیاریدا بەختی تاقی بکاتەوە. شوان هەمیشە لەگەڵ گورگ و ساڵی بێبارانیدا یاری بەبەختی دەکات، هەر ئەوەش ژیانی شوان چالاک دەکات.

گوتی، «دووجار ئەو خەونەم بینیووە. لەخەونمدا لەگەڵ مەڕەکان لەکێڵگەیەکدا بووم، ئەوجا منداڵێک دەرکەوت و دەستیکرد بەیاریکردن لەگەڵ ئاژەڵەکان. نامەوێ خەڵکی کاری وا بکەن، چونکە







مەڕەکان لەبێگانە دەترسن. بەڵام وا دیارە هەمیشە منداڵان دەتوانن کایەیان لەگەڵدا بکەن، بەبێ ئەوەی بشیان ترسێنن. نازانم بۆ. نازانم چۆن ئاژەڵان لەبارەی تەمەنی مرۆڤەوە دەزانن.»

ژنەکە گوتی، «زیاتر باسی خەونەکەتم بۆ بکە. دەبێ بڕۆم بەلای چێشتلێنانەکەمەوە. لەبەر ئەوەش کە پارەیەکی زۆرت پێنییە، ناتوانم کاتێکی زۆرت بۆ تەرخان بکەم.»

کوڕەکە بەکەمێک تووڕەییەوە بەردەوام بوو، «منداڵەکە بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر یاریکردن لەگەڵ مەڕەکان بەردەوام بوو. ئەوجا لەناکاو منداڵەکە هەر دوودەستی گرتم و گواستمیەوە بۆ هەڕەمەکانی میسر.»

کەمێک وەستا، تا بۆیدەربکەوێ گەر ژنەکە شتێک لەسەر هەڕەمەکانی میسر بزانێ. بەڵام پیرەژنەکە هیچی نەگوت.

«ئەوجا لەهەڕەمەکانی میسر،» — ئەم چەند وشەیەی بەهێواشی گوت، تا ژنەکە تێبگات — «منداڵەکە پێی گوتم، ئەگەر بێیتە ئێرە، سامانێکی شاراوە دەدۆزیتەوە. پاشان هەر کە ویستی شوێنی تەواوی سامانەکەم پێبلێ، خەبەرم بووەوە. هەر دوو جارەکە بەو شێوەیە بوو.»

ژنەکە ماوەیەک بێدەنگ بوو. ئەوجا دووبارە دەستەکانی گرتەوە و بۆ ماوەیەک تەماشایکردن. گوتی، «ئێستا هیچ پارەیەکت لێ ناسەنم، بەڵام ئەگەر سامانەکەت دۆزیەوە، لەدەیا یەکیم دەوێ.»

کوڕەکە لەخۆشیدا پێکەنی. دەیتوانی لەبەر ئەو خەونەی کە لەبارەی سامانی شاراوەوە بینیبووی، ئەو پارە کەمە پاشەکەوت بکات، کە پێی بوو!

گوتی، «باشە، خەونەکە لێکبدەرەوە.»

«یەکەمجار سوێندم بۆ بخۆ. سوێندم بۆ بخۆ، کە لەدەیا یەکی







سامانەکەتم لەبەرامبەر ئەوەدا دەدەیتێ، کە پێتی دەڵێم.»

کوڕەکە سوێندی بۆ خوارد. پیرەژنەکە گوتی، کە گوایا دەبێ تەماشای وێنەی دڵی پیرۆزی عیسا بکات و دووبارە سوێندی بۆ بخواتەوە.

گوتی، «ئەم خەونە بەزمانی جیهانە. دەتوانم لێکی بدەمەوە، بەڵام لێکدانەوەکەی زۆر ئاڵۆزە. هەر لەبەر ئەوەیە پێم وایە شایانی بەشێک لەو شتە بم، کە دەیدۆزیتەوە.

«ئەمەش لێکدانەوەی منە: دەبێ بڕۆی بۆ هەرەمەکانی میسر. هەرگیز لەبارەی ئەو شوێنەوە هیچم نەبیستووە. بەڵام ئەگەر منداڵێک نیشانتی دابێ، کەواتە بوونی هەیە. لەوێ سامانێک دەدۆزیتەوە و دەتکاتە پیاوێکی دەوڵەمەند.»

کوڕەکە سەری سوڕمابوو و جاڕس بووبوو. نەدەبوو لەبەر خاتری ئەمە بەدووی ئەو ژنە پیرەدا بگەڕێ! بەڵام بەبیری کەوتەوە، کە پێویست ناکا لەبەرامبەردا هیچ بڕە پارەیەک بدات.

کوڕەکە گوتی، «پێویست ناکا لەپێناو ئەوەدا کاتی خۆم بەفیڕۆ بدەم.»

«پێم گوتی خەونەکەت ئاڵۆزە. هەر شتە سادەکانی ژیانن، کە بەو شێوەیە سەیرن؛ تەنیا مرۆڤی زرنگ لێیان تێدەگا. لەبەر ئەوەیش کە من کەسێکی زیرەک نیم، دەبوو شتێکی دیکە فێر ببم، هەر وەک دەست گرتنەوە.»

«ئەی چۆن بگەمە میسر؟»

«من تەنیا خەون لێکدەدەمەوە. نازانم چۆن بیانهێنمەدی. هەر لەبەر ئەوەیە دەبێ لەگەڵ ئەو شتانەدا بژیم، کە کچەکانم بۆیان دیاریکردووم.»

«ئەی چی دەبێ گەر هەرگیز نەچم بۆ میسر؟

«ئەو کاتە منیش پارە وەرناگرم. ئەوەیش یەکەمجار نابێ.»
ئەوجا ژنەکە بەکورەکەی گوت بڕوات، گوتی کاتێکی زۆری تێدا بەفیڕۆ داوە.

کورەکە هیوابڕاو بوو؛ بڕیاریدا هەرگیز جارێکی تر بڕوا بەخەون نەکات. بیری کەوتەوە، کە چەندین شتی هەیە و دەبێ ئاگای لێیان بێ. ڕۆیشت بۆ بازاڕەکە، تا شتێ بخوات، کتێبەکەی بەدانەیەکی ئەستوورتر گۆڕییەوە و کورسییەکی لەگۆڕەپانەکە دۆزییەوە، کە دەیتوانی لەوێ شەرابە نوێیەکەی تاقی بکاتەوە. ڕۆژێکی گەرم بوو، شەرابەکەش ئاسوودەبەخش بوو. مەڕەکان لەدەروازەی شارەکە بوون، لەتەویلەی هاوڕێیەکی. کورەکە چەندین خەڵکی لەشارەکە دەناسی. هەر ئەوەش گەشتی لەلا جوانکردبوو — هەمیشە هاوڕێی نوێی دەدۆزیەوە و پێویستیشی بەوە نەبوو هەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵیاندا بەسەربەرێ. کاتێ کەسێ هەموو ڕۆژێ کۆمەڵێک خەڵکی دووبارە دەبینێ، هەر وەک ئەوەی لەقوتابخانەی کاسۆلیکی بەسەر خۆیدا هاتبوو، وردە وردە ئەو خەڵکە دەبنە بەشێک لەژیانی کەسەکە. ئەوجا دەیانەوێ کەسەکە بگۆڕێ. ئەگەر کەسێ بەو شێوەیە نەبێ، کە خەڵکانی تر گەرەکیانە، ئەوا تووڕە دەبن. وادیارە خەڵکی فیکرەیەکی باشیان هەیە بۆ ئەوەی چۆن خەڵکانی تر ژیان بگوزەرێنن، بەڵام کەس فیکرەی بۆ ژیانی خۆی پێنییە.

بڕیاریدا کەمێکی تر چاوەڕێ بکا، تا خۆرەکە زیاتر لەئاسماندا خوار دەبێتەوە و پاشان بگەڕێتەوە بۆلای مێگەلەکەی و بیانباتەوە بۆ ناو کێڵگەکان. لەپاش سێ ڕۆژی تر، دەگەیشتە لای کچی بازرگانەکە.

دەستیکرد بەخوێندنەوەی ئەو کتێبەی کڕیبووی. لەیەکەم لاپەڕەدا، باسی مەراسیمی بەخاکسپاردنێکی دەکرد. بێژانی ناوی







ئـەو کەسـانەی نـاو کتێبەکـەش زۆر زەحمـەت بـوون. لەبیـری خۆیـدا گوتـی، ئەگـەر ڕۆژێ لـەڕۆژان کتێبێـک بنووسـم، ئـەوا لەیـەک کاتـدا تەنیا یـەک کـەس بەشداری پێدەکـەم، بـەو شـێوەیەش پێویسـت ناکا خوێنـەر نیگەرانـی لەبەرکردنـی ئـەو هەمـوو نـاوە بـێ.

کاتـێ لەخوێندنەوەکـەدا چڕ بووبـووەوە، زیاتـر حـەزی لەکتێبەکـە بـوو؛ مەڕاسیمەکە لەڕۆژێکـی باراناویـدا بـوو، کوڕەکـەش بەخێرهاتنـی لەسـەرما دەکـرد. کاتـێ دەیخوێنـدەوە، پیاوێکـی پیـر بەتەنیشـتییەوە دانیشـت و دەیویسـت گفتوگۆیـەک بکاتـەوە. پیرەپیاوەکـە ئامـاژەی بۆ خەڵکـی گۆڕەپانەکـە کـرد و پرسـی، «ئەوانـە چـی دەکـەن؟»

کوڕەکـە بەوشـکی گوتـی، «کار دەکـەن،» دەیویسـت وادەربکـەوێ، کـە دەیـەوێ خـۆی بەخوێندنەوەکەیـەوە خەریـک بـکات.

لـە ڕاسـتیدا بیـری لـەوە دەکـردەوە، کـە چـۆن لەبەردەمـی کچـی بازرگانەکـەدا مـەڕەکان دەبڕێتـەوە، بـەو شـێوەیەش کچەکـە خـۆی دەبینێـی، کـە دەتوانـێ کاری گـران بـکات. چەندینجـار وێنـای ئـەم دیمەنـەی کردبـوو؛ هەمـوو جـارێ لەئەندێشـەیدا کچەکـە سـەری دەسـوڕما، کاتـێ کوڕەکـە دەیگـوت دەبـێ مـەڕەکان لەپشـتەوە بـۆ پێشـەوە ببڕدرێنـەوە. هەوڵیشـیدەدا چەنـد چیرۆکێکـی بیربکەوێتـەوە، تا لەکاتـی مـەڕ بڕینەوەکـەدا بۆیبگێڕێتـەوە. زۆرینـەی ئـەو چیرۆکانـەی لەکتێبەکانـەوە خوێندبووەوە، بـەڵام پێـی دەگـوت لەئەزموونـی تایبەتـی خۆیـەوە سـەرچاوەیان گرتـووە. کچەکـە هەرگیـز جیاوازییەکـەی نەدەزانـی، چونکـە خوێنـدەواری نەبـوو.

لەهەمـان کاتـدا، پیاوەکـە سـووربوو لەسـەر هەوڵـی خـۆی بـۆ دامەزراندنـی گفتوگۆیـەک. گوتـی ماندوو و تینـووە و داوای لێکـرد گـەر بتوانـێ قومـێ لەشـەرابی کوڕەکـە بـدات. کوڕەکـە بتڵەکـەی بۆ ڕاگرت، خوازیاربـوو پیرەپیاوەکـە بەجێـی بهێڵێـت.







بەڵام پیاوە پیرەکە حەزی لەقسەبوو و لەکوڕەکەی پرسی چ کتێبێک دەخوێنێتەوە. کوڕەکە هەوڵیدا تووڕە دەربکەوێ و بچێتە سەر کورسییەکی تر، بەڵام باوکی فێریکردبوو ڕێز لەخەڵکانی لەخۆی بەتەمەنتر بگرێ. ئەوجا کتێبەکەی بۆ پیاوەکە ڕاگرت — لەبەر دوو هۆکار: یەکەم، لەبەر ئەوەی خۆی بەتەواوەتی دڵنیا نەبوو چۆن ناونیشانی کتێبەکە دەخوێندرێتەوە؛ دووەمیش، ئەگەر پیاوەکە خوێندەواری نەبایە، بۆخۆی شەرمەزار دەبوو و دەچووە سەر کورسییەکی تر.

هەر وەک ئەوەی بابەتێکی سەمەرە بێ، پیرەپیاوەکە تەماشای هەموو لاکانی کتێبەکەی کرد و گوتی، «هممم ... ئەمە کتێبێکی گرنگە، بەڵام زۆر بێزارکەرە.»

کوڕەکە سەری سوڕما. پیاوەکە خوێندەواری هەبوو و ئەو کتێبەشی خوێندبووەوە. ئەگەر وەک پیاوەکەش گوتی، کتێبەکە جاڕسکەر بایە، هێشتا کاتی لەبەردەستدابوو بیگۆڕێ بەدانەیەکی تر.

پیرەپیاوەکە بەردەوام بوو، «ئەم کتێبە باسی ئەو شتە دەکا، کە نزیکەی هەموو کتێبەکانی جیهان باسی دەکەن. باسی بێتوانایی خەڵک دەکات لەهەڵبژاردنی چارەنووسی خۆیاندا. بەوەش کۆتایی پێدێ، کە دەڵێ هەموو کەس بڕوا بەگەورەترین درۆی جیهان دەکات.»

کوڕەکە بەتەواوەتی سەری سوڕمابوو و پرسی، «گەورەترین درۆی جیهان چییە؟»

«ئەمەیە: لەخاڵێکی ژیانماندا، کۆنترۆڵی ئەوە لەدەست دەدەین، کە بەسەرماندا ڕوودەدات، بەو شێوەیەش چارەنووس ژیانمان زەوت دەکات. ئەوە گەورەترین درۆی جیهانە.»







کوڕەکە گوتی، «هەرگیز ئەوەم بەسەر نەهاتووە. ئەوان ویستیان ببم بەقەشە، بەڵام بڕیارمدا ببم بەشوان.»

پیرەپیاوە گوتی، «زۆر باشترە، چونکە زۆرت حەز لەگەشتکردنە.»

کوڕەکە بەخۆی گوت، «زانی بیر لەچی دەکەمەوە.» لەهەمان کاتدا پیرەپیاوەکە پەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە، وادیاربوو نایەوێ بیگەڕێنێتەوە. کوڕەکە پێی وابوو جلەکانی پیاوەکە سەیرن. لەو عەرەبانە دەچوو، کە زۆر کات لەو ناوچانە دەردەکەوتن. ئەفەریقا چەند کاتژمێرێک لەتاریفەوە دوور بوو؛ هەر ئەوەندەی دەویست بەبەلەم بەدەربەندە باریکەکاندا بپەڕێتەوە. زۆرینەی کات عەرەبەکان لەشارەکە دەردەکەوتن، شتیان دەکڕی و چەندجارێک لەڕۆژێکدا نزا سەیرەکەیان دەخوێند.

کوڕەکە پرسی، «خەڵکی کوێیت؟»

«خەڵکی زۆر شوێنم.»

کوڕەکە گوتی، «کەس ناتوانێ خەڵکی زۆر شوێن بێ. من شوانم و چەندین شوێن گەڕاوم، بەڵام تەنیا خەڵکی یەک شوێنم – خەڵکی شارێکی نزیک کۆشکێکی گەورەم. لەو شوێنە لەدایک بووم.»

«باشە، کەواتە دەتوانم بڵێم لەسەلیم لەدایک بووم.»

کوڕەکە نەیدەزانی سەلیم لەکوێیە، بەڵام نەشیدەویست بپرسێ، دەترسا گەمژە دەربکەوێ. بۆ ماوەیەک تەماشای خەڵکی گۆڕەپانەکەی کرد؛ دەهاتن و دەچوون و هەمووشیان زۆر سەرقاڵ دیاربوون.

پرسی، «ئەی سەلیم چۆنە؟» هەوڵیدەدا کەمێک زانیاری دەست بکەوێ.

«بەو شێوەیەیە، کە هەمیشە بووە.»

هێشتا زانیاری چنگ نەکەوتووە. بەڵام دەیزانی سەلیم

لەئەندەلوسیا نییە. ئەگەر لەوێ بایە، ئەوا لەبارەیەوە دەیبیست.
لەسەر پرسیارەکانی سوور بوو، «ئەی کارت چییە لە سەلیم؟»
کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، خەڵکی شتی سەمەرە دەڵێن. هەندێکجار واباشترە لەگەڵ مەڕەکاندا بی، ئەوان هیچ شتێ ناڵێن. هێشتاش واباشترە لەگەڵ کتێبێکدا بەتەنیا بیت. کتێبەکان لەو کاتانەدا چیرۆکی خەیاڵیت بۆ دەگێڕنەوە، کە خۆت دەتەوێ گوێبیستیان بی. بەڵام کاتێ لەگەڵ خەڵکی قسە دەکەی، شتی هێندە سەیر دەڵێن، کە هەر نازانی چۆن درێژە بەگفتوگۆکە بدەی.
پیرەپیاوەکە گوتی، «ناوم مێلشیزەدەکە. ئایا چەند مەڕت هەیە؟»

کوڕەکە گوتی، «مەڕی تەواوم هەیە.» بۆیدەرکەوت پیاوە پیرەکە دەیەوێ زیاتر لەبارەی ژیانییەوە بزانێ.
«کەواتە کێشەیەکمان هەیە. ناتوانم یارمەتیت بدەم، ئەگەر پێت وابێ مەڕی تەواوت هەیە.»
کوڕەکە بێزار بوو. ئەو داوای یارمەتی نەکردبوو. ئەوە پیرەپیاوەکە بوو، کە داوای قوومێ شەرابی کردبوو و دەستی بەگفتوگۆ کردبوو.
کوڕە گوتی، «کتێبەکەم بەرەوە. دەبێ بچم مەڕەکانم کۆبکەمەوە و بڕۆم.»

پیرەپیاوەکە گوتی، «لەدەیا یەکی مەڕەکانتم بدەرێ و پێت دەڵێم چۆن سامانە شاراوەکەت بدۆزیتەوە.»
کوڕەکە خەونەکەی بیرکەوتەوە و لەناکاو هەموو شتێکی بۆ ڕوون بووەوە. پیرەژنەکە پارەی لێ وەرنەگرتبوو، بەڵام پیاوە پیرەکە — کە ڕەنگە مێردی ژنەکە بێ — دەیویست ڕێگەیەک بدۆزێتەوە تا پارەیەکی زۆر لەبەرامبەر شتێکدا وەربگرێت، کە هەر بوونی نییە. بەدڵنیاییەوە پیرەپیاوەکەش قەرەج بوو.







بـەڵام بـەر لـەوەی کوڕەکـە شـتێ بڵـێ، پیرەپیاوەکـە خـۆی داموکانـدەوە، چیلکەیەکـی هەڵگـرت و دەسـتیکرد بەنووسـین لەسـەر لمـی گۆڕەپانەکـە. شـتێکی بریقـەدار لەسـنگییەوە هێنـدە بەتیـژی ڕەنگـی دایـەوە، کـە کوڕەکـە نەیتوانـی بـۆ ماوەیەکـی کاتـی هیـچ شـتێ ببینـێ. بەجووڵەیـەک، کـە زۆر خێرابـوو بـۆ تەمەنـی پیاوەکـە، ئـەو شـتەی نـاو ڕۆبەکـەی شـاردەوە. کاتـێ دووبـارە توانـی ببینـێ، کوڕەکـە ئـەو شـتانەی خوێنـدەوە، کـە پیاوەکـە لەسـەر لمەکـە نووسـیبوونی.

لەسـەر لمـی گۆڕەپانـی شـارە بچووکەکـە، کوڕەکـە نـاوی دایکـی و ئـەو خوێندنگـە کاسـۆلیکییەی خوێنـدەوە، کـە لێـی خوێندبـوو. نـاوی کچـی بازرگانەکـەی خوێنـدەوە، کـە کـەس لـەو بـارەوە نەیدەزانـی، نـاوی شتگەلێکیشـی خوێنـدەوە، کـە هەرگیـز بەهیـچ کەسـێکی نەگوتبـوون.



پیاوەکە گوتبووی، «من پاشای سەلیمم.»

کوڕەکـە بەشـەرمەزارییەوە پرسـی، «بۆچـی دەبـێ پاشـایەک لەگـەڵ شـوانێکدا بـدوێ؟»

«لەبـەر چەنـد هۆکارێـک. بـەڵام بـا بڵێیـن گرنگترینیـان ئەوەیـە، کە تـۆ سـەرکەوتنت بەدەسـت هێنـاوە لەدۆزینـەوەی چارەنووسـی خۆتـدا.»

کوڕەکە نەیدەزانی «چارەنووس»ی مرۆڤ چییە.

«ئەوەیـە کـە هەمیشـە ویسـتووتە بەدەسـتی بهێنـی. هەمـوو کەسـێ لەلاویـدا دەزانـێ چارەنووسـی خـۆی چییـە.

«لـەو خاڵـەی ژیانیانـدا، هەمـوو شـتێ ڕوون و شـیاوە. لەخەونبینین ناترسـن و بیـر لەهەمـوو ئـەو شـتانە دەکەنـەوە، کە دەیانـەوێ لەژیانیاندا ڕووبـدات. بـەڵام لەگـەڵ تێپەڕینـی کاتـدا، هێزێکـی نادیـار قایلیانـدەکات

بەوەی مەحاڵە چارەنووسی خۆیان بهێننە دی.»

هیچ کام لەو شتانەی پیرەپیاوەکە گوتی بەلای کوڕەکەوە زۆر گرنگ نەبوو. بەڵام دەیویست بزانێ «ئەو هێزە نهێنییە» چییە؛ کاتێ باسیدەکرد، سەرنجی کچی بازرگانەکەی ڕادەکێشا.

«ئەو هێزەیە کە نەرێنییانە دەردەکەوێ، بەڵام لەڕاستیدا نیشانیدەدا چۆن چارەنووست بکەیتە واقع. ڕۆح و ویستت ئامادە دەکات، چونکە یەک ڕاستی مەزن لەسەر ئەم هەسارەیە بوونی هەیە: هەر کەسێ بیت و هەر شتێ بکەی، کاتێ شتێکت گەرەکە، لەبەر ئەوەیە ئەو شتە لەناو ڕۆحی گەردوونەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەوە کاری تۆیە لەسەر زەوی.»

«گەر تەنانەت ئەوەی دەتەوێ گەشتکردن بێ؟ یان هاوسەرگیریکردن بێ لەگەڵ کچی بازرگانێکی چنیندا؟»

«بەڵێ، گەر تەنانەت گەڕان بێ بەدووی سامانیشدا. ڕۆحی جیهان لەسەر شادی خەڵکی گەشە دەکات. هەروەها بەغەمباری و ئیرەیی و دڵپیسییش. دۆزینەوەی چارەنووس ئەرکی مرۆڤە. هەموو شتەکان یەکن.

«کاتێ شتێکت گەرەکە، تەواوی جیهان لەبەدەست هێنانیا یارمەتیت دەدا.»

بۆ ماوەیەک هەردووکیان بێدەنگ بوون، تێبینی گۆڕەپان و خەڵکی شارۆچکەکەیان دەکرد. یەکەمجار پیرەپیاوەکە دەستی بەقسەکردن کردەوە.

«بۆچی ئاگاداری مێگەلێک دەکەیت؟»

«چونکە حەزم لەگەشتکردنە.»

پیرەپیاوەکە ئاماژەی بۆ نانەوایەک کرد، کە لەبەردەم پەنجەرەی دوکانەکەیدا، لەسووچێکی گۆڕەپانەکەدا، وەستابوو. «کاتێ منداڵ

بوو، ئەو پیاوەش دەیویست گەشت بکات. بەڵام بڕیاریدا یەکجار نانەواخانەکەی بکڕێت و هەندێک پارە پێکەوە بنێ. کاتێ پیر دەبێ، یەک مانگ لەئەفەریقا بەسەر دەبات. هەرگیز بۆیدەرنەکەوتووە، کە خەڵکی دەتوانن لەهەرتەمەنێکدا ئەوە بەدی بێنن، کە خەونی پێوە دەبینن.»

کوڕەکە گوتی، «دەبوو بڕیاری بوون بەشوانی بدابا.»

پیرەپیاوەکە گوتی، «بیری لەوەش کردبووەوە. بەڵام نانەواکان لەشوانەکان گرنگترن. نانەواکان ماڵیان هەیە، لەکاتێکدا شوانەکان لەدەرەوە دەخەون. دایک و باوکانیش زیاتر حەز دەکەن منداڵەکانیان هاوسەرگیری لەگەڵ نانەواکان بکەن، وەک لەشوانەکان.»

کوڕەکە لەدڵیدا هەستی بەئازارێک دەکرد، بیری لەکچی بازرگانەکە دەکردەوە. بەدڵنیاییەوە نانەوایەکیش لەشارۆچکەکەی ئەودا هەیە.

پیرەپیاوەکە بەردەوام بوو، «لە ماوەیەکی درێژدا، ئەوەی خەڵکی لەبارەی شوان و نانەواکانەوە بیری لێدەکەنەوە، لەچارەنووسی خۆیان گرنگتر دەبێ.»

پیاوەکە پەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدایەوە و چووە سەر لاپەڕەیەک و دەستی بەخوێندنەوەی کرد، کوڕەکە چاوەڕێیکرد، پاشان خوێندنەوەکەی بەپیاوەکە بڕی، هەر وەک چۆن خۆی پێی بڕدرابوو. «بۆچی هەموو ئەم شتانەم پێدەڵێی؟»

«چونکە دەتەوێ چارەنووسی خۆت بکەیتە واقع. ئێستاش لەو خاڵەدایت، کە خەریکە بەتەواوەتی کۆڵی لێدەدەیت.»

«تۆش هەمیشە لەو دیمەنانەدا دەردەکەوی؟»

«هەمیشە بەو جۆرە نییە، بەڵام هەمیشە لەشێوەیەک یا شێوەیەکی تردا دەردەکەوم. هەندێکجار لەشێوەی چارەسەرێک، یان فیکرەیەکی باشدا دەردەکەوم. لەکاتی تردا، لەساتی یەکلاکەرەوەدا،

شتەکان بۆ ڕوودان ئاسانتر دەکەم. شتی دیکەش دەکەم. بەڵام زۆرینەی کات خەڵکی پێی نازانن ئەو کارانە دەکەم.»

پیرەپیاوەکە باسی ئەوەی کرد، کە هەفتەی پێشوو ناچار بووبوو لەبەردەمی کانکارێکدا ، لەشێوەی بەردێکدا دەربکەوێ. کانکارەکە کۆڵی لەهەموو شتێک دابوو، تا بڕوات بەدووی زمروتێکدا بگەڕێ. ماوەی پێنج ساڵبوو لەڕووبارێکدا کاریدەکرد، لەپێناو گەڕان بەدووی زمروتدا، سەدان هەزار بەردی پشکنیبوو. خەریکبوو کانکارەکە کۆڵ لەهەموو شتێک بدات، لەکاتێکدا ئەگەر یەک بەردی دیکەی بپشکنیبا – تەنیا یەک بەردی تر – زمروتەکەی دەدۆزییەوە. لەبەر ئەوەی کانکارەکە هەموو شتێکی کردبووە قوربانی چارەنووسی خۆی، پیرەپیاوەکە بڕیاری دابوو خۆی لەبابەتەکەوە بگلێنێ. خۆی کردبوو بەبەردێک و خل بووبووەوە بۆ بەر پێکانی. کانکارەکەش، کە لەپێنج ساڵی بێبەرهەمی خۆی تووڕە و بێزار بوو، بەردەکەی هەڵگرتبوو و فڕەی دابووە لاوە. بەڵام هێندە بەتووندی فڕێی دابوو، کە بەردەکە شکابوو و لەناویشیدا، جوانترین زمروتی جیهانی تێدا بووبوو.

پیرەپیاوەکە بەداغ لەدڵی گوتی، «خەڵکی لەسەرەتای ژیانیاندا فێر دەبن هۆکاری بوونیان چییە. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێ، کە هەر زوو کۆڵ دەدەن. بەڵام شتەکە بەو شێوەیەیە.»

کوڕەکە بیری پیرەپیاوەکەی خستەوە، کە شتێکی لەبارەی سامانی شاراوەوە گوتبوو.

پیرەپیاوەکە گوتی، «ئاوی خوڕ پەردە لەسەر سامان هەڵدەماڵێ، هەر هەمان ئەو تەوژمانەش لەخاکدا دەینێژن. ئەگەر دەتەوێ شتێ لەبارەی سامانەکەتەوە بزانی، دەبێ لەدەیا یەکی مێگەلەکەتم بدەیتێ.»







«ئەی پێت چۆنە لەدەیا یەکی سامانەکەمت بدەمێ؟»

پیاوەکە هیوابڕاو دیاربوو. «ئەگەر بەڵێنی بەخشینی ئەو شتانە بدەیت، کە هێشتا دەستت نەکەوتوون، ئەوا هەر زوو ئارەزووی بەدەست هێنانیان لەدەست دەدەیت.»

کوڕەکە گوتی گوایا بەڵێنی بەخشینی لەدەیا یەکی سامانەکەی بەقەرەجێک داوە.

پیرەپیاوەکە ئاهێکی هەڵکێشا. «قەرەجەکان لەو کارانەدا پسپۆڕن. بەهەرشێوەیەک بێ، شتێکی باشە کە فێری ئەوە بووی هەموو شتێکی ناو ژیان نرخی هەیە. ئێمەی جەنگاوەری ڕووناکی دەمانەوێ ئەو شتانە فێری خەڵکی بکەین.»

پیرەپیاوەکە کتێبەکەی بۆ کوڕەکە گەڕاندەوە.

«سبەی ڕێک لەم کاتەدا لەدەیا یەکی ڕانەمەڕەکەتم بۆ بهێنە. ئەوجا پێت دەڵێم چۆن سامانە شاراوەکەت بدۆزیتەوە. پاشنیوەڕۆیەکی خۆش.»

پاشان لەسووچی گۆڕەپانەکەدا ون بوو.



کوڕەکە دەستی بەخوێندنەوەی کتێبەکە کردەوە، بەڵام ئیدی نەیدەتوانی سەرنجی لای بێ. پەشۆکاو و تووڕە بوو، چونکە دەیزانی پیرەپیاوەکە ڕاست دەکات. ڕۆیشت بۆ نانەواخانەکە و نانێکی کڕی، بیری لەوە دەکردەوە ئەوە بەنانەواکە بڵێ، کە پیرەپیاوەکە گوتبووی. لەبیری خۆیدا گوتی، هەندێکجار وا باشترە شتەکان وەک خۆیان بەجێ بێڵی، پاشان بڕیاریدا هیچ نەڵێ. ئەگەر شتێکی بگوتبا، ئەوا نانەواکە سێ ڕۆژ بیری لەوە دەکردەوە کۆڵ لەهەموو







شتێک بدات، گەرچی بەشتەکانیش ڕاهاتبوو. بەدڵنیاییەوە کوڕەکە دەیتوانی نانەواکە تووشی ئەو نیگەرانییە نەکا. ئەوجا لەناو شارەکەدا دەستی بەپیاسەکردن کرد و خۆی لەبەردەم دەروازەکاندا بینییەوە. لەوێ بینایەکی بچووکی پەنجەرە کراوە هەبوو، کە خەڵکی دەیانتوانی بلیتی ڕۆیشتن بۆ ئەفەریقای لێبکڕن. دەشیزانی میسر لەئەفەریقایە.

پیاوی پشت پەنجەرەکە پرسی، «دەتوانم یارمەتیت بەم؟»

کوڕەکە بەدەم ڕۆیشتنەوە گوتی، «ڕەنگە سبەی بتوانی.» ئەگەر یەک دانەی لەمەڕەکان بفرۆشتبا، پارەی تەواوی بەشی ئەوە پێدەبوو لەبەندەرەکە بپەڕێتەوە. ئەو فیکرەیە دەیترساند.

بلیتفرۆشەکە بینی کوڕەکە دەڕوات و بەیاریدەدەرەکەی گوت، «هیواخوازێکی تر. پارەی بەشی گەشتەکەی پێنییە.»

کاتێ لەبەردەمی پەنجەرەکەدا وەستابوو، کوڕەکە بیری مێگەلەکەی هاتەوە و بڕیاریدا بگەڕێتەوە و ببێتەوە بەشوان. لەماوەی دوو ساڵدا، هەموو شتێک لەبارەی شوانییەوە فێر بووبوو: دەیزانی چۆن خوورییەکەیان ببڕێتەوە، چۆن ئاگاداری کاوڕە ئاوسەکان بێت و چۆن لەگورگ بیانپارێزێ. هەموو کێڵگە و لەوەڕگەکانی ئەندەلوسیا شارەزابوو. نرخی تەواوی هەریەک لەئاژەڵەکانیشی دەزانی.

بڕیاریدا درێژترین ڕێگە بەرەو تەویلەی هاوڕێکەی بگرێتە بەر. کاتێ بەلای قەڵای شارەکەدا تێپەڕی، بڕیاریدا گەڕانەوەکەی دوابخات و بەسەر ڕەمپا بەردینەکەدا سەرکەوێ بۆ سەر دیوارەکە. لەوێوە دەیتوانی لەدوورەوە ئەفەریقا ببینێ. جارێک کەسێک پێی گوتبوو، موورەکان لەوێوە هاتوون تا تەواوی ئیسپانیا داگیر بکەن.

لەوێوە دەیتوانی تەواوی شارەکە و گۆڕەپانەکەش ببینێ، ئەو شوێنەی لێی دانیشت و قسەی لەگەڵ پیرەپیاوەکە کرد. لەبیری







تێدا بینی. ئەو خۆیدا گوتی، نەفرەت لەو ساتەی پیرەپیاوەکەم تێدا بینی. ئەو تەنیا بۆ دۆزینەوەی ئەو ژنە هاتبووە شارۆچکەکە، کە دەیتوانی خەون لێک بداتەوە. نە ژنەکە و نە پیاوەکەش گرنگییان بەو راستییە نەدەدا، کە ئەو شوانە. ئەوان کەسانێکی تەنیان، کە ئیدی باوەڕ بەشتەکان ناکەن، لەوەش تێناگەن، کە شوانەکان عاشقی مەڕەکانیان دەبن. هەموو شتێکی لەبارەی هەر دانەیەکی ناو مێگەلەکەیەوە دەزانی: دەیزانی کامەیان شەلە، کامەیان دوو مانگی تر دەزێ و کامەشیان تەمەڵترینە. دەیزانی چۆن بیانبرێتەوە و چۆنیش سەریان ببڕێ. ئەگەر هەر کات بڕیاری بدابا بەجێیان بێڵێ، ئازاریان دەچەشت.

با هەڵیکرد. بەو بایە ئاشنا بوو: خەڵکی پێیان دەگوت بای مەشرق، چونکە موورەکان لەمەشرقەوە هاتبوون، لەخۆرهەڵات و دەریای ناوەڕاستەوە.

بایەکە توندتر دەبوو. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ئەوەتا، لەنێوان مێگەلەکەم و سامانەکەمدا تیاماوم. دەبوو هەڵبژێرێ لەنێوان شتێک، کە پێی ڕاهاتبوو و شتێک، کە دەیویست هەیبێ. با کچی بازرگانەکەش لەولاوە بوەستێ، بەڵام ئەو هێندەی ڕانەمەڕەکە گرنگ نەبوو، چونکە پشتی بەکوڕەکە نەدەبەست. ڕەنگە هەر لەیادیشیکردبێ. دڵنیابوو لەوەی بۆ کچەکە هیچ جیاوازییەکی نییە کەی ئەم دەچێتە گوندەکە: بۆ کچەکە، هەموو ڕۆژەکان هەر هەمان شت بوون، کاتێکیش ڕۆژێک لەڕۆژی دواتر دەچێ، لەبەر ئەوەیە ئەو کەسانە ناتوانن ئەو شتە باشانە ببینن، کە لەهەموو ڕۆژێکی ژیانیاندا، لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا، دەردەکەون.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، دایک و باوک و قەڵای شارەکەمم بەجێ هێشتووە. ئەوان لەدووری من ڕاهاتوون و منیش هەر بەهەمان

شێوەم. مەڕەکانیش بەبێ منی ڕادێن.

لەو شوێنەی دانیشتبوو، دەیتوانی تێبینی گۆڕەپانەکە بکات. خەڵکی بەردەوام دەچوونە نانەواخانەکە و دەهاتنە دەرەوە. کوڕ و کچێکی لاو لەسەر ئەو کورسییە دانیشتبوون، کە لەگەڵ پیاوە پیرەکە قسەیان لێی کردبوو و یەکیان ماچ دەکرد.

«نانەواکە ...» ئەوەی لەبیری خۆیدا گوت، بەبێ ئەوەی بیرکردنەوەکەی تەواو بکات. بای مەشرق بەهێزتر دەبوو و لەسەر دەموچاوی هەستی بەهێزی بایەکە دەکرد. ئەو بایە موورەکانی هێنابوو، بەڵێ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، بۆنی بیابان و کچە پەچەپۆشەکانیشی هێنابوو. عارەقە و خەونی ئەو پیاوانەی هێنابوو، کە جارێک لەجاران بۆ گەڕان ڕۆیشتبوون بەدووی شتێکی نەزاندراو و ئاڵتوون و سەرکەشیدا — هەروەها بۆ هەڕەمەکان. کوڕەکە ئیرەیی بەئازادی بایەکە دەبرد، بۆیشی دەرکەوت، کە خۆیشی دەتوانێ هەمان ئازادیی هەبێ. جگە لەخۆی، هیچ شتێ نەبوو ڕێگەی لێبگرێ. مەڕەکان، کچی بازرگانەکە و کێڵگەکانی ئەندەلوسیا تەنیا هەنگاوێک بوون لەدرێژەی ڕێگەی چارەنووسیدا.

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، کوڕەکە چاوی بەپیرەپیاوەکە کەوتەوە. شەش مەڕی لەگەڵ خۆی هێنابوو.

کوڕەکە گوتی، «سەرم سوڕماوە. هاوڕێکەم هەموو مەڕەکانی دیکەی کڕی. گوتی هەمیشە حەزیکردووە ببێتە شوان، ئەوەش پێشهاتێکی باشە.»

پیرەپیاوەکە گوتی، «بەو شێوەیە کە هەمیشە هەر وابووە. ئەوە پێی دەگوترێ سەرەتاکانی پێشهاتی باش. کاتێ بۆ یەکەمجار یاری کاغەز دەکەی، تەقریبەن بەتەواوەتی دڵنیای دەیبەیتەوە. ئەوەیش بەختی دەستپێکەرە!»







«ئەوەیان چییە؟»

«لەبەر ئەوەی هێزێک هەیە و دەیەوێ چارەنووسی خۆتت بۆ دەربکەوێ؛ ئەوست پڕ لەتامی بردنەوە دەکات.»

ئەوجا پیاوەکە دەستی بەپشکنینی مەڕەکان کرد و بۆیدەرکەوت دانەیەکیان شەلە. کوڕەکە بۆیڕوونکردەوە، کە ئەوەیان گرنگ نییە، چونکە زرنگترین کاوڕی ناو مێگەلەکەیە و زۆرترین خووریشی هەیە.»

کوڕەکە پرسی، «سامانەکە لەکوێیە؟»

«لە میسرە، نزیک هەڕەمەکان.»

کوڕەکە ترسا. پیرەژنەکەش هەر هەمان شتی گوتبوو. بەڵام هیچ شتێکی لەبەرامبەردا وەرنەگرتبوو.

«بۆ دۆزینەوەی سامانەکە، دەبێ دوای پێشهاتەکان بکەوی. خودا ڕاڕەوی بۆ هەموو کەسێک داناوە. تەنیا پێویستە ئەو پێشهاتانە بخوێنیتەوە، کە بۆت داندراون.»

بەر لەوەی کوڕەکە وەڵام بداتەوە، پەپوولەیەک هات و لەنێوان ئەو و پیرەپیاوەکەدا فڕی. شتێکی بیرکەوتەوە، کە جارێک باوە گەورەی پێی گوتبوو: کە گوایا پەپوولە پێشهاتێکی باشە. هەر بەشێوەی سیسرک و هیوا؛ وەک مارمێلکە و وێنجەی چوارپەڕە.

پیرەپیاوەکە توانی بیرۆکەکانی کوڕەکە بخوێنێتەوە و گوتی، «ڕاستە، ڕێک بەو شێوەیەیە، کە باپیرەت فێریکردووی. ئەو شتانە پێشهاتی باشن.»

پیرەپیاوەکە ڕۆبەکەی کردەوە و کوڕەکەش سەری لەوە سوڕما، کە بینی. پیاوە پیرەکە سینەبەندێکی بەستبوو، کە لەئاڵتوونێکی قورس دروستکرابوو و بەبەردی بەنرخیش ڕووپۆش کرابوو. کوڕەکە زیرەکی ڕۆژی پێشووی پیرەپیاوەکەی بیرکەوتەوە.

هەر بەڕاستی پاشا بوو! ئەڵبەتە بۆیە خۆی گۆڕیووە، تا خۆی






لەدزی نەخوازراو بپارێزێ.

پیرەپیاوەکە بەردێکی ڕەش و بەردێکی سپی بۆ کوڕەکە ڕاگرت، کە لەناوەڕاستی سینەبەندەکەدا جێگیر کرابوون و گوتی، «ئەمانە بگرە. پێیان دەگوترێ ئوریم و تومیم. ڕەشەکە ئاماژەی «بەڵێ« یە و سپییەکەش «نەخێر»ە. کاتێ نەتتوانی پێشهاتەکان بخوێنیتەوە، ئەمانە یارمەتیت دەدەن. هەمیشە پرسیاری مەبەست بکە.

«بەڵام گەر توانیت، هەوڵ بدە بڕیاری خۆت بدەیت. سامانەکە لەهەرەمەکانە؛ خۆشت ئەوەت دەزانی. بەڵام بۆیە سوور بووم لەسەر وەرگرتنی شەش مەڕەکە، چونکە لەبڕیارەکەدا یارمەتیم داویت.»

کوڕەکە بەردەکانی خستە جانتاکەیەوە. لەو کاتە بەدواوە، ئیدی خۆی بڕیاری خۆی دەدا.

«لە یادت نەچێ، هەر شتێ کە مامەڵەی لەگەڵ دەکەی، تەنیا شتێکە و هیچی تر. زمانی پێشهاتەکانیشت لەیادت نەچێ. لەیادیشت نەچێ هەتا کۆتایی دوای چارەنووسی خۆت بکەوی.

«بەڵام بەر لەوەی بڕۆم، چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە.

«دوکانداری کوڕەکەی دەنێرێ بۆلای زاناترین پیاوی جیهان تا فێری نهێنیی خۆشبەختی بکا. کوڕەکە چل ڕۆژان بەناو بیاباندا ڕۆیشت، لەکۆتاییدا گەیشتە قەڵایەکی جوان، کە لەسەر بناری چیایەک بوو. پیاوە زاناکە لەو شوێنە دەژیا.

«لە جێی ئەوەی پیاوێکی پیرۆز ببینێ، کاتێ پاڵەوانەکەمان لەدەرگای سەرەکی کۆشکەکەوە دەچێتە ژوورێ، چاوی بەجەنجاڵییەک دەکەوێ: بازرگانەکان دەهاتن و دەچوون، خەڵکی لەسووچەکاندا دەدوان، ئۆرکیسترایەکی بچووک میوزیکێکی نیانی دەژەنی و مێزێکیش بەبەتامترین خواردنەکانی ئەو بەشەی جیهان ڕازێندرابووەوە. پیاوە زاناکە لەگەڵ هەمووان قسەیدەکرد، بەو شێوەیەش دەبوو کوڕەکە







دوو کاتژمێر چاوەڕێبکا تا سەرەی دێت.

«پیاوە زاناکە بەوریایی گوێی بۆ ڕوونکردنەوەی کوڕەکە گرت، تا بزانێ بۆچی هاتووە، بەڵام گوتی کاتی ئەوەی نییە نهێنیی خۆشبەختی پێبڵێ. داوایکرد کوڕەکە بەناو قەڵاکەدا بگەڕێ و لەماوەی دوو کاتژمێردا بگەڕێتەوە بۆلای.

«پیاوە زاناکە کەوچکێکی چای بۆ کوڕەکە ڕاگرت، کە دوو دڵۆپ ڕۆنی تیابوو و گوتی، 'دەمەوێ لەهەمان کاتدا داوای شتێکت لێبکەم. کاتێ بەناو کۆشکەکەدا دەگەڕێی، با ئەم کەوچکەشت پێبێ، بەبێ ئەوەی بهێڵیت ڕۆنەکە بڕژێ.'

«کوڕەکە بەچەندین ڕاڕەوی پلیکانەیی کۆشکەکەدا هات و چوو، چاوی لەسەر کەوچکە ڕۆنەکە لانەدەبرد. لەپاش دوو کاتژمێر، گەڕایەوە بۆ ئەو ژوورەی پیاوە زاناکەی لێبوو.

«پیاوە زاناکە پرسی، 'باشە، ئایا ئەو چندراوە ئێرانیانەت بینی، کە لەژووری نانخواردنەکە هەڵواسراون؟ ئایا ئەو باخچەیەت بینی، کە سەرۆکی باغەوانەکان دە ساڵان بەدروستکردنییەوە خەریک بووە؟ ئایا کاغەزە دێرینەکانی ناو کتێبخانەکەمت بینی؟'

«کوڕەکە شەرمەزاربوو و دانی پێدا نا، کە تێبینی هیچ شتێکی نەکردووە. تەنیا پەیوەستی نەڕشتنی ئەو ڕۆنە بوو، کە پیاوە زاناکە پێی سپاردبوو.

«پیاوە زاناکە گوتی، 'کەواتە بگەڕێرەوە و تەماشای شتە سەیرەکانی جیهانی من بکە. ناتوانی متمانە بەپیاوێ بکەی، گەر شارەزای ماڵەکەی نەبی.'

«کوڕەکە بوژایەوە، کەوچکەکەی هەڵگرتەوە و دەستیکردەوە بەگەڕان بەناو کۆشکەکەدا، ئەم جارە تێبینی هەموو کارە هونەرییەکانی بنمیچ و دیوارەکانی کرد. باخچەکان، چیای دەوروبەر،





جوانی گوڵەکان و هەموو ئەو نموونانەی بینی، کە شتەکانی لەگەڵدا هەڵبژێردرابوون. کاتێ گەڕایەوە بۆلای پیاوە زاناکە، بەباشی باسی هەموو ئەو شتانەی بۆ کرد.

«پیاوە زاناکە پرسی، 'ئەی ئەو دوو دڵۆپە ڕۆنە چی لێهات، کە پێم سپاردبووی؟'

«کوڕەکە تەماشای ناو کەوچکەکەی دەستی کرد و بۆیدەرکەوت ڕۆنەکەی تیا نەماوە.

«زانای زانایان گوتی، 'کەواتە دەتوانم یەک ئامۆژگاریت بکەم. نهێنیی کامەرانی ئەوەیە تەماشای هەموو شتە سەیرەکانی جیهان بکەیت و هەرگیز نەیەڵی دڵۆپە ڕۆنەکانی ناو کەوچکەکەت بڕژێن.'»

شوانەکە هیچی نەگوت. لەو چیرۆکە تێگەیشت، کە پاشا پیرەکە بۆیگێڕابووەوە. ڕەنگە شوان حەزی بەگەشت بێ، بەڵام هەرگیز نابێ مەڕەکانی لەیاد بکات.

پیاوەکە تەماشای کوڕەکەی کرد، هەردوو دەستی پێکەوە گرتبوو و چەند تەشەرێکی سەمەرەی بەسەر سەری کوڕەکەدا کرد. ئەوجا مەڕەکانی خۆی برد و ڕۆیشت.



لە بەرزترین خاڵی تاریفەدا قەڵایەکی کۆن هەیە، کە موورەکان دروستیانکردووە. پیاو دەتوانێ لەسەر دیوارەکانییەوە تەماشای ئەفەریقا بکا. ئەو پاشنیوەڕۆیە مێلشیزەدەکی پاشای سەلیم لەسەر دیوارەکە دانیشتبوو و بای مەشرق لەدەموچاوی دەدا. مەڕەکان لەنزیکییەوە شێتگیرانە دەجووڵانەوە، لەگەڵ خاوەنە نوێکەیان نیگەران بوون و بەو هەموو گۆڕانکارییە چالاک بوون. هەموو ئەوەی







دەیانویست، خواردن و ئاو بوو.

مێلشێزەدەک کەشتییەکی بچووکی بینی، کە بەرەو بەندەرەکە دەکشا. ئیدی هەرگیز کوڕەکەی نەدەبینییەوە، هەر وەک ئەوەی چۆن لەپاش وەرگرتنی لەدەیا یەکی کرێکە، ئەبراهەمیشی نەبینییەوە. ئەوە کاری خۆی بوو.

ڕەنگە خوداکان تاوانیان نەبێ، چونکە چارەنووسیان نییە. بەڵام پاشای سەلیم لەناخەوە ئاواتی دەخواست کوڕەکە سەرکەوتوو بێ.

لەبیری خۆیدا گوتی، زۆر خراپە کە هەر زوو ناوەکەم لەیاد دەکات. دەبوو بۆم دووبارە بکردبایەتەوە. بەو شێوەیەش کاتێ باسی منی دەکرد، دەیتوانی بڵێ من مێلشێزەدەکم، پاشاکەی سەلیم.

تەماشای ئاسمانی کرد، کەمێک هەستی بەشەرمەزاری کرد و گوتی، «خودایا، وەک خۆت گوتت، دەزانم ئەمە لەخۆباییبوونە. بەڵام پاشایەکی پیر، دەبێ هەندێکجار کەمێک شانازی بەخۆیەوە بکات.



کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ئەفەریقا چەندە سەیرە.

لە بارێک دانیشتبوو، کە لەهەموو بارەکانی تری شەقامە تەنگەکانی تانجیەر دەچوو. هەندێک پیاو لەپایپێکی زەبەلاحەوە دوکەڵیان هەڵدەمژی، کە هەریەکەیان نەفەسێکی لێدەدا و دەیدا بەوەی دوای خۆی. تەنیا لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا بینی پیاوان دەست لەدەستی یەک دەڕۆن، ژنان پەچەیانکردووە و مەلاکان دەچوونە سەری سەرەوەی قوللەیەک و نزایان دەخوێند — هەموو کەسەکانی چواردەوریشی دەکەوتنە سەر ئەژنۆ و ناوچاوانیان







دەنووسـاند بەزەوییەکـەوە.

بـە خـۆی گـوت، «مەشـقی بێبـاوەڕان.» وەک منداڵێکـی کڵێسـە، هەمیشـە تەماشـای وێنەکەی قەشـە سـانتیاگۆ ماتۆمۆڕۆسـی کردووە، کە بەسـواری ئەسـپەکەیەوە شمشـێرەکەی لەکیفەکـەی دەرهێنـاوە و چەنـد کەسـێک چۆکیـان لەبەردەمیـدا داداوە. کوڕەکـە هەسـتی بەبێتاقەتـی و تەنیاییەکـی زۆر دەکـرد. بێبـاوەڕەکان بەشـێوەیەکی خـراپ تەماشـای ئەویـان دەکـرد.

لەگـەڵ ئەمەشـدا، لەپەلەپەلـی گەشـتەکەیدا شـتێکی لەیادکردبـوو، تەنیـا یـەک شـت، کـە ڕەنگبوو ئەو شـتەش بـۆ ماوەیەکی زۆر لەگەیشـتن بەسـامانەکەی دوای بخـات: لـەو وڵاتـەدا تەنیـا زمانـی عەرەبـی قسـەی پێدەکرا.

خاوەنـی بارەکـە لێـی نزیـک بـووەوە، کوڕەکـەش ئامـاژەی بـۆ خواردنەوەیـەک کـرد، کـە لەمێزەکـەی تەنیشـتی خزمـەت کرابـوو. چاییەکـی تـاڵ بـوو. کوڕەکـە شـەرابی بەباشـتر دەزانـی.

بـەڵام لەئێسـتادا کاتـی ئـەوە نەبـوو نیگەرانـی ئـەو جـۆرە شـتانە بێ. ئەوەی ئێسـتا سـەرقاڵیکردبوو، سـامانەکە و شـێوازی دەسـتکەوتنی بـوو. فرۆشـتنی مـەڕەکان پـارەی تـەواوی بـۆ تەرخانکردبـوو، کوڕەکـەش دەیزانـی هەمیشـە لەپـارەدا جادوویـەک هەیـە؛ ئـەوەی پـارەی پێبـێ، هەرگیـز تەنیـا نییـە. ڕەنگـە بـەر لەتێپەڕینـی ماوەیەکـی زۆر بگاتـە هەرەمـەکان. هەرگیـز پیرەپیاوێـک بەسـینەبەندێکی ئاڵتوونییـەوە بـۆ دەسـتکەوتنی شـەش مـەڕان درۆ نـاکا.

پیرەپیاوەکـە باسـی نیشـانە و پێشـهاتی کردبـوو، کاتێکیـش لەدەربەندەکـە دەپەڕییـەوە، کوڕەکـە بیـری لەپێشـهاتەکان دەکـردەوە. بەڵـێ، پیرەپیاوەکـە دەیزانـی باسـی چـی دەکات: لـەو ماوەیـەدا کـە کوڕەکـە لەکێڵگەکانـی ئەندەلوسـیا بەسـەری بردبـوو، فێربووبـوو







بەتێبینیکردنی ئاسمان و زەوی پارەوەکان هەڵبژێرێ. فێربووبوو هەبوونی جۆرە باڵندەیەک واتای ئەوەیە مار لەو ناوچەیەدا هەیە، هەروەها سەوزبوونی چەند دەوەنێک، واتای بوونی ئاوە لەشوێنەکەدا. مەرەکان فێری ئەوەیان کردبوو.

لە بیری خۆیدا گوتی، ئەگەر خودا بەو شێوە باشە رابەری مەرەکان بکات، ئەوا رابەری مرۆڤیش دەکات، ئەوەیش ئاسوودەتریکرد. تاڵی چایەکە لەدەمیدا کەمتر بووبووەوە.

گوێی لەدەنگێکبوو بەئیسپانی پرسی، «تۆ کێیت؟»

کورەکە بوژایەوە. بیری لەپێشهات دەکردەوە و لەو کاتەشدا کەسێک دەرکەوت.

پرسی، «چۆن ئیسپانی دەزانی؟» میوانە نوێیەکە بەرگێکی خۆرئاوایی لەبەردا بوو، بەڵام رەنگی پێستی دەیگوت خەڵکی ئەم شارەیە. تەقریبەن هەر لەتەمەنی کورەکەدا بوو.

«نزیکەی هەموو کەسێ لێرە ئیسپانی دەزانێ. تەنیا دوو کاتژمێر لەئیسپانیاوە دووریین.»

کورەکە گوتی، «دانیشە با بەشتێک خزمەتت کەم. پەرداغێک شەرابیش بۆ من داواکە. رقم لەم چایەیە.»

پیاوە گەنجەکە گوتی، «ئەم وڵاتە شەرابی تیا نییە. ئایین حەرامیکردووە.»

ئەوجا کورەکە پێی گوت دەیەوێ بگاتە هەرەمەکان. خەریکبوو باسی سامانەکەشی بۆ بکات، بەڵام بریاریدا لەو بارەوە هیچ نەڵێ. ئەگەر بیگوتبا، رەنگبوو عەرەبەکەش داوای بەشێکی بکردبا تا بیگەیەنێتە ئەوێ. ئەوەی بیرکەوتەوە، کە پیرەپیاوەکە لەبارەی بەخشینی شتێکەوە گوتبووی، کە هێشتا نەبووی بەخاوەنی.

«دەمەوێ بمبەیتە ئەوێ. دەتوانم پارەی رابەرایەتییەکەت

پێیبەخشم.»

میوانەکە پرسی، «هیچ بیرۆکەیەکت هەیە بۆ گەیشتن بەوێ؟»

کوڕەکە تێبینیکرد خاوەنی بارەکە لەنزیک ئەوانەوە وەستاوە و بەباشی گوێ بۆ گفتوگۆکەیان دەگرێ. بەو دۆخە ئاسوودە نەبوو. بەڵام ڕابەرێکی دۆزیبووەوە و نەشیدەویست ئەو هەلە لەدەست بدات.

پیاوە گەنجەکە گوتی، «دەبێ تەواوی بیابانی سەحرا ببڕیت، بۆ ئەو مەبەستەش، پێویستت بەپارەیە. دەمەوێ بزانم پارەت پێیە یان نا.»

کوڕەکە پێی وابوو پرسیارێکی سەیریکردبێ. بەڵام بڕوای بەپیاوە پیرەکە دەکرد، کە گوتبووی، کاتێک شتێکت گەرەکە، تەواوی گەردوون لەبەدیهێنانیدا یارمەتیت دەدات.

پارەکەی لەجانتاکەی دەرهێنا و پیشانی پیاوە گەنجەکەی دا. خاوەنی بارەکە نزیک بووەوە و ئەویش تەماشایکرد. ئەو دوو پیاوە بەعەرەبی چەند وشەیەکیان گۆڕییەوە، خاوەن بارەکە جاڕس دیاربوو.

میوانەکە گوتی، «با لێرە بڕۆینە دەرەوە. دەیەوێ لێرە بڕۆین.»

کوڕەکە بوژایەوە. هەستا پارەی حیسابەکەی بدات، بەڵام خاوەن بارەکە گرتی و بەدەنگێکی بەرز دەستی بەقسەکردن کرد. کوڕەکە بەهێزبوو و دەیویست تۆڵە بکاتەوە، بەڵام لەوڵاتێکی بێگانەدا بوو. هاوڕێ نوێیەکەی پاڵی بەخاوەن بارەکەوە نا و کوڕەکەی ڕاکێشایە دەرێ. گوتی، «دەیەوێ پارەکەت لێبسەنێ. تانجیەر وەک شوێنەکانی دیکەی ئەفەریقا نییە. ئێرە بەندەرە و هەموو بەندەرێکیش بەشی خۆی دزی تێدایە.»

کوڕەکە باوەڕی بەهاوڕێ تازەکەی هەبوو. لەدۆخێکی مەترسیداردا یارمەتی دابوو. پارەکەی دەرهێنا و ژماردی.







هاوڕێکەی پارەکەی لێوەرگرت و گوتی، «سبەی دەگەینە هەرەمەکان، بەڵام جارێ دەبێ دوو وشتر بکڕم.»

بە شەقامە تەنگەکانی تانجیەردا دەڕۆیشتن. هەموو شوێنەکان پڕبوون لەکۆشکی شت فرۆشتن. گەیشتنە ناوەڕاستی گۆڕەپانێکی گەورە، کە بازاڕە سەرەکییەکەی لەخۆ گرتبوو. هەزاران خەڵکی لێبوو، قسەیاندەکرد، شتیان دەفرۆشت و دەیانکڕی؛ سەوزەوات لەناوەڕاستی خەنجەرفرۆشیدا، هەروەها مافوور بەتەنیشتی تووتنەوە داندرابوو. بەڵام کوڕەکە چاوی لەسەر هاوڕێ تازەکەی لانەدەبرد. لەپاش هەموو شتێ، پارەکەی بەو بوو. بیریکردەوە داوای گەڕانەوی پارەکەی بکات، بەڵام بڕیاریدا لێیگەڕێ، چونکە ڕەنگە شتێکی نەشیاو بێ. هیچ شتێکی لەبارەی نەریتەکانی ئەو خاکە نوێیەوە نەدەزانی.

بەخۆی گوت، «تەنیا تەماشا دەکەم.» دەیزانی لەهاوڕێکەی بەهێزترە.

لەناکاو، لەناوەڕاستی ئەو جەنجاڵییەدا، جوانترین شمشێری بینی، کە هەتا ئەو کاتە شتی وای نەبینیبوو. زیو لەکیفەکەیدا بەکارهێندرابوو و دەسکەکەی بەبەردی بەنرخ ڕووپۆشکرابوو. کوڕەکە بەڵێنی بەخۆی دا، کاتێ لەمیسر گەڕایەوە ئەو شمشێرە بکڕێ.

بە هاوڕێکەی گوت، «بپرسە ئەو شمشێرە بایی چەنە.» ئەوجا بۆیدەرکەوت بۆ ساتێک فەرامۆش کراوە. هەر تەماشای شمشێرەکەی دەکرد. دڵی گوشرابوو و لەناکاو سینەی پەستانی خستە سەر دڵی. لەڕوو وەرگێڕان دەترسا، چونکە دەیزانی چی دەبینێ. کەمێکی تر لەسەر تەماشاکردنی شمشێرەکە بەردەوام بوو، هەتا وێرای ئاوڕ بداتەوە.

تەنیا بازاڕەکەی لەدەور بوو، خەڵکی دەهاتن و دەچوون،






هاواریاندەکرد و شتیان دەفرۆشت، پڕیشبوو لەبۆنی سەیری خواردن ... بەڵام هاوڕێ نوێیەکەی لەهیچ شوێنێکەوە دیار نەبوو.

کوڕەکە دەیویست باوەڕبکات بەڕێکەوت لەهاوڕێکەی جیابووەتەوە. بڕیاریدا ڕێک لەوێدا بمێنێتەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی بکات. کاتێ چاوەڕێیدەکرد، مەلایەک بەسەر قوللەیەکی ئەو نزیکانەدا سەرکەوت و دەستی بەنزاخوێندن کرد؛ هەموو خەڵکی ناو بازاڕەکە کەوتنە سەر ئەژنۆ، سەریان بەزەوییەکەوە دەنووساند و نزاکەیان دەگوتەوە. ئەوجا هەر وەک کۆمەڵە مێروولەیەکی کارکەر، کۆشکەکانیان داخست و ڕۆیشتن.

خەریکبوو خۆریش ئاوا دەبوو. کوڕەکە تەماشای لاربوونەوەی خۆرەکەی دەکرد، تا لەپشتی خانووە سپییەکانی دەوری گۆڕەپانەکەدا ون بوو. بیری کەوتەوە، کاتێ خۆری ئەو بەیانییە هەڵهات، ئەو لەقاڕەیەکی تر بوو، هێشتا شوانی شەست مەڕبوو و چاوەڕوانی بینینی کچێک بوو. ئەو بەیانییە ئاگاداری ڕوودانی هەموو شتەکان بوو، ئەو کات لەناو کێڵگەکاندا بوو. بەڵام ئێستا واخەریکە خۆر ئاوادەبێ و ئەو لەوڵاتێکی دیکەیە، بێگانەیەک لەوڵاتێکی بێگانەدا، کە هەر زمانەکەشیان نازانێ. بەڵام ئیدی ئەو شوان نەبوو و هیچی نەبوو، تەنانەت پارەکەشی پێنەمابوو تا بگەڕێتەوە و لەسەرەتاوە دەست بەهەموو شتێ بکاتەوە.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، تەواوی ئەو شتانە لەنێوان خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابووندا ڕوویاندا. بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە و سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە هێندە بەخێرایی و بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕانکاری بەسەر ژیانیدا هاتبوو.

هێندە شەرمەزاربوو حەزیدەکرد بگری. تەنانەت هەرگیز لەبەر چاوی مەڕەکانیشیدا نەگریابوو. بەڵام بازاڕەکە چۆڵبوو و







لەنیشتمانیش دوور بوو، بۆیە گریا. گریا، چونکە خودا دادپەروەر نەبوو، چونکە ئەوە ڕێگەی خودابوو بۆ چاکەدانەوەی ئەو کەسانەی شوێنی خەونەکانیان دەکەون.

لەبیری خۆیدا گوتی، کاتێ مەڕەکانم هەبوو، شادمان بووم و ئەوانەی چواردەورم و خۆشم دڵخۆشدەکرد. کاتێ خەڵکی دەیانبینیم، بەخێرهاتنیان لێدەکردم. بەڵام ئێستا غەمبار و تەنیام. لەمەودوا لەگەڵ خەڵکی توونـد دەبم و باوەڕیان پێناکەم، چونکە کەسێک خیانەتی لێکردم. قینم لەوانە دەبێ، کە سامانی خۆیانیان دۆزیوەتەوە، چونکە هەرگیز هی خۆمم نەدۆزییەوە. ئەوەش دەپارێزم کە هەمە، چونکە زۆر بچووکم بۆ ئەوەی جیهان ببەزێنم.

جانتاکەی کردەوە تا بزانێ گەر شتێ پارەی پێمابێ؛ ڕەنگە باقی پارەی ئەو لەفەیەی پێمابێ، کە لەسەر کەشتییەکە کڕی. بەڵام هەموو ئەوەی دۆزییەوە کتێبە قورسەکەی، چاکەتەکەی و ئەو دوو بەردە بوو، کە پیاوە پیرەکە پێی بەخشی.

کاتێ تەماشای بەردەکانی کرد، لەبەر هۆکارێ هەستی بەژیانەوە کرد. دەیتوانی بەردەکان بفرۆشێ و بلیتێکی گەڕانەوەی پێبکڕێ. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، بەڵام ئەمجارە ژیرتر دەبم، پاشان لەجانتاکەی دەریهێنان تا بیانکاتە گیرفانی. ئەمە بەندەرە و تاکە شتی ڕاستیش کە هاوڕێکەی پێی گوتبوو، ئەوەیە کە هەموو بەندەرێک پڕیەتی لەدز.

ئێستا بۆیدەرکەوت بۆچی خاوەنی بارەکە تووڕەبوو: هەوڵیدەدا پێی بڵێ باوەڕ بەو پیاوە نەکات. «من وەک هەموو کەسێکی ترم — جیهان بەو شێوەیە دەبینم، کە خۆم گەرەکمە، نەک بەشێوە حەقیقیەکەی.»

بەهێواشی پەنجەی بەسەر بەردەکاندا دەهێنا و هەستی





بەگەرمییەکەیان دەکرد. بەردەکان سامانی ئەو بوون. تەنیا بەدەستەوەگرتنیان ئەویان ئاسوودەدەکرد. پیرەپیاوەکەیان بەبیر دەخستەوە.

گوتبووی، «کاتێ شتێکت گەرەکە، تەواوی گەردوون لەبەدەست هێنانیا یارمەتیت دەدات.»

کوڕەکە دەیویست لەڕاستی ئەوە تێبگات، کە پیاوە پیرەکە گوتبووی. ئەوەتا، ئەو لەبازاڕەکە بوو، یەک دیناری پێنەبوو و یەک مەڕیشی لانەبوو تا لەشەوەکەدا چاودێرییانبکات. بەڵام بەردەکان شایەتی ئەوەبوون چاوی بەپاشایەک کەوتبوو - پاشایەک، کە ڕابردووی کوڕەکەی دەزانی.

«ئەمانە ئوریم و تومیمن، لەخوێندنەوەی پێشهاتەکاندا یارمەتیت دەدەن.» کوڕەکە بەردەکانی خستەوە ناو جانتاکەی و بڕیاریدا تاقیکردنەوەیەک بکات. پیرەپیاوەکە داوای لێکردبوو پرسیاری زۆر ڕوون بکات، بۆ ئەو مەبەستەش، دەبوو کوڕەکە بزانێ چی گەرەکە. ئەوجا پرسی گەر هێشتا نزای پیاوەکە کاریگەری لەسەر کوڕەکە هەبێ.

یەکێک لەبەردەکانی دەرهێنا. بەردی «بەڵێ« بوو.

پرسی، «ئایا سامانەکەم دەدۆزمەوە؟» دەستی بەجانتاکەیدا کرد و بۆ یەکێک لەبەردەکان دەگەڕا. لەکاتی گەڕانەکەیدا، هەردوو بەردەکە لەکونێکی جانتاکەوە کەوتنە خوارێ بۆ سەر زەوییەکە. کوڕەکە هەرگیز تێبینی نەکردبوو کونێک لەجانتاکەیدا هەیە. لەسەر ئەژنۆ بۆ ئوریم و تومیم دەگەڕا تا بیانخاتەوە ناو جانتاکە. بەڵام کاتێ بینی لەسەر زەوییەکەن، دەستەواژەیەکی تر بەمێشکیدا هات.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «پێشهاتەکان بناسەرەوە و دوایانبکەوە.»

پێشهات. کوڕەکە بزەیەکیکرد. دوو بەردەکەی هەڵگرتەوە و







خستنیەوە ناو جانتاکەی. بڕیاریدا کونەکە پینە نەکات — بەردەکان هەرکات بیانویستبا، دەیانتوانی بکەونە خوارێ. فێربووبوو چەند شتێک هەن، کە نابێ پرسیاریان لەبارەوە بکەی، تا بەو شێوەیەش لەچارەنووسی خۆت هەڵنەیەیت. بەخۆی گوت، «بەڵێنمدا خۆم بڕیاری خۆم بدەم.»

بەڵام بەردەکان گوتبوویان هێشتا پیرەپیاوەکە یارمەتی دەدات، ئەوەش وای لێدەکرد زیاتر بڕوای بەخۆی هەبێ. دووبارە تەماشای گۆڕەپانە چۆڵەکەی کرد، ئەمجارەیان کەمتر بێهیوایی پێوە دیاربوو. ئەو شوێنە نامۆ نەبوو؛ شوێنێکی نوێ بوو.

لەپاش هەموو شتێکیش، ئەو شتەی هەمیشە گەرەکیبوو ئەمە بوو: بینینی شوێنی نوێ. ئەگەر هەرگیزیش نەگەشتایەتە هەرەمەکان، ئەوا هێشتا لەهەموو شوانە ناسیاوەکانی زیاتر گەشتیکردبوو. لەبیری خۆیدا گوتی، خۆزگا دەیانزانی لەپاش دووری دوو کاتژمێر بەکەشتی، شتەکان چەندە جیاوازن. لەگەڵ ئەوەشدا، جیهانە نوێیەکەی ئەو لەم کاتەدا بازاڕە چۆڵەکە بوو، بەڵام پێشتر ژیانی تێدا بینیبوو و هەرگیزیش لەیادی نەدەکرد. شمشێرەکەی بیرکەوتەوە. بەو بیرکردنەوەیە ئازاری دەچەشت، بەڵام هەرگیز پێشتر دانەیەکی لەو شێوەیەی نەبینیبوو. کاتێ لەو شتانە دەفکرا، بۆیدەرکەوت دەبێ هەڵبژێرێ لەنێوان بیرکردنەوە لەخۆی وەک قوربانی دەستی دزێک، یان وەک سەرکێشێک لەپێناو گەڕان بەدووی سامانەکەیدا.

بە خۆی گوت، «سەرکێشم و بەدووی سامانەکەمدا دەگەڕێم.»









خێرا کەسێک بەئاگای هێنایەوە. لەناوەڕاستی بازاڕەکەدا خەوی لێکەوتبوو و خەریکیشبوو ژیان لەبازاڕەکەدا دەستی پێدەکردەوە. تەماشای چواردەوری خۆی کرد و بۆ مەڕەکان گەڕا، بەڵام بیری کەوتەوە، کە لەجیهانێکی نوێدایە. بەڵام لەجێی غەمباربوون، شادمان بوو. ئیدی پێویستی نەدەکرد بەدوای خۆراک و ئاودا بگەڕێ بۆ مەڕەکان؛ لەجێی ئەوە دەیتوانی بڕوات بۆ سامانەکەی بگەڕێ. یەک دینار لەگیرفانیا نەبوو، بەڵام باوەڕی هەبوو. شەوی پێشتر بڕیاری دابوو هەر بەشێوەی ئەو کەسانە سەرکێش بێ، کە لەکتێبەکاندا خوێندبوویەوە.

بەهێواشی بەناو بازاڕەکەدا دەڕۆیشت. فرۆشیارەکان شتەکانیان لەدەوری کۆشکی فرۆشیەکانیان خڕدەکردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش، کوڕەکە یارمەتی شیرینیفرۆشێکی دا. شیرینیفرۆشەکە بزەی لەسەر لێو بوو: دڵخۆش بوو، ئاگاداری ژیانی خۆیبوو و ئامادەی ڕۆژێکی نوێی کارکردن بوو. خەندەی پیرەپیاوەکەی بەبیری کوڕەکە خستەوە — ئەو پاشا پیرە سەیرەی چاوی پێی کەوتبوو. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، «شیرینیفرۆشەکە لەبەر ئەوە شیرینی نافرۆشێ تا بتوانێ دواتر گەشتبکات و هاوسەرگیری لەگەڵ کچی دوکاندارێک بکات. لەبەر ئەوە دەیکات، کە خۆی ئارەزووی کردنی ئەو کارەی هەیە.» ئەویش پێی وابوو بتوانێ هەمان ئەو کارە بکات، کە پیرەپیاوەکە دەیکرد — دەیتوانی پێبزانێ کەسێ لەچارەنووسی خۆی نزیکە یا دوورە. تەنیا بەتەماشاکردنیان. لەبیری خۆیدا گوتی، ئاسانە و هەرگیزیش نەمکردووە.

کاتێ کۆشکەکەی ئامادەبوو، شیرینیفرۆشەکە یەکەم شیرینی ئەو ڕۆژە، کە خۆی دروستیکردبوو، پێشکەشی کوڕەکەی کرد. کوڕەکە سوپاسیکرد، خواردی و ڕێگەی خۆی گرتەوە بەر. پاشان بیری







کەوتــەوە، کاتــێ کۆشــکی شتفرۆشــتنەکەیان دەســازاند، یەکێکیــان بەعەرەبــی و ئــەوی تریــان بەئیســپانی قســەیدەکرد.

هێشتاش بەباشی لەیەکدی تێدەگەیشتن.

کوڕەکـە لەبیـری خۆیـدا گوتـی، دەشـێ ئـەو زمانـە پشـت بەوشـە نەبەستێ. پێشـتر ئـەو ئەزموونـەی لەگـەڵ مـەڕەکان کردووە و ئێسـتاش هەمـان شـت لەگـەڵ مرۆڤـدا ڕوودەدات.

چەندیـن شـتی نـوێ فێردەبـوو. هەندێـک لـەو شـتانە ئەوانەبـوون، کـە پێشـتر ئەزموونیکردبـوون و نـوێ نەبـوون، بـەڵام هەسـتی پێیـان نەکردبوو. هەستی پێنەکردبوون، چونکـە پێیان ڕاهاتبـوو. بیریکردەوە: ئەگـەر لـەم زمانـە بـێ وشـەیە تێبگـەم، دەتوانـم لەجیهـان تێبگـەم.

بەهێمنــی و بێپەلــە، کاتــی پیاســەکردن بەشــەقامێکی تانجیــەردا، بیــری لــەوە دەکــردەوە. تەنیــا بــەو شــێوەیە دەیتوانــی پێشــهاتەکان بخوێنێتــەوە. دەیزانــی ئارامییەکــی زۆری دەوێ، بــەڵام شــوان هەمــوو شــتێ لەبــارەی ئارامییــەوە دەزانــێ. جارێکــی تــر لــەو زەوییــە نامۆیــەدا بۆیدەرکــەوت، هەمــان ئــەو ئەزموونانــە دەکات، کــە لەگــەڵ مــەڕەکان کردبوونــی.

پیرەپیاوەکە گوتبووی، «هەموو شتەکان یەکن.»



کریستاڵفرۆشـەکە ئـەو بەیانییـە بەئـاگا هـات و هەسـتی بەهەمـان ئەو نیگەرانییـە دەکـرد، کـە هەمـوو بەیانییەکانـی تـر هەسـتی پێکردبـوو. سـی سـاڵە لەهەمـان شـوێندایە: دوکانێـک لەسـەر شـەقامێکی گـرداوی، کـە چەنـد کڕیارێکـی کـەم پێیـدا تێدەپـەڕن. ئێسـتا زۆر درەنگـە بـۆ گۆڕینـی تـەواوی شـتەکان — هەمـوو ئـەوەی تـا ئێسـتا فێـری بووبـوو،

بەتەنیا کڕین و فرۆشتنی شووشەی کریستاڵی بوو. کاتی خۆی خەڵکێکی زۆر شارەزای دوکانەکەی بوون: بازرگانی عەرەب، زەویناسی فەرەنسی و ئینگلیز، سەربازی ئەڵمانی، کە هەمیشە دەوڵەمەند بوون. لەو ڕۆژگارەدا کریستاڵفرۆشتن شتێکی نایاب بوو، بیریشی لەوە دەکردەوە چۆن دەوڵەمەند ببێت و لەگەڵ بەساڵاچوونیدا ژنی جوان بەدەوریەوە بن.

بەڵام بەتێپەڕینی کات، تانجیەر گۆڕا. شارەکەی تەنیشتیان، سێوتا، لەتانجیەر خێراتر گەشەیکرد و بەو شێوەیەش شارەکەی ئەوان کاری تێدا نەما. دراوسێکان ئەوییان بەجێ هێشت و تەنیا چەند دوکانێکی کەم لەسەر گردەکە مانەوە. کەسیش ئامادە نەبوو بەگردەکەدا هەڵبزنێ تەنیا بۆ ئەوەی سەردانی چەند دوکانێک بکات.

بەڵام کریستاڵفرۆشەکە هەڵبژاردەی تری نەبوو. سی ساڵی تەمەنی بەکڕین و فرۆشتنی کریستاڵەوە بەسەربردبوو، ئێستاش بۆ گۆڕینی هەر شتێک زۆر درەنگ بوو.

تەواوی بەیانییەکەی بەتێبینیکردنی هاتووچۆی دەگمەنی خەڵکی شەقامەکەوە بەسەربرد. ئەوە پیشەی چەند ساڵەیبوو و وای لێهاتبوو خشتەی کاتی هەموو ئەو کەسانەی دەزانی، کە بەوێدا تێپەڕ دەبوون. بەڵام کەمێک بەر لەخوانی نیوەڕۆ، کوڕێک لەبەردەم دوکانەکەدا وەستا. بەرگێکی ئاسایی پۆشیبوو، بەڵام چاوە شارەزاکانی فرۆشیارەکە بۆیدەرکەوت کوڕەکە پارەی پێنییە. لەگەڵ ئەوەشدا، فرۆشیارەکە بڕیاریدا کەمێک نیوەڕۆخوانەکەی دوابخات، تا کوڕەکە لەوێ بڕوات.









لافیتەیەک بەدەرگاکەوە هەڵواسرابوو و نووسرابوو چەند زمانێک لەدوکانەکەدا قسەی پێدەکرێت. کوڕەکە بینی پیاوێک لەپشتی مێزەکەوە دەرکەوت.

کوڕەکە گوتی، «گەر دەتەوێ، دەتوانم شووشەکانی ناو پەنجەرەکەت بۆ پاک بکەمەوە. بەم شێوەیە جوان نین و کەس تاقەتی نییە بیانکڕێ.»

بە بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، پیاوەکە تەماشایدەکرد.

«لە بەرامبەریشدا دەتوانی شتێکم بدەیتێ بیخۆم.»

هێشتا پیاوەکە بێدەنگ بوو، کوڕەکەش بۆیدەرکەوت دەبێ بڕیارێک بدات. چاکەتەکەی لەجانتاکەیدابوو — بەدڵنیاییەوە لەبیاباندا کاری پێی نەدەبوو. چاکەتەکەی دەرهێنا و دەستیکرد بەسڕینەوەی شووشەکان. لەماوەی نیو کاتژمێردا تەواوی شووشەکانی ناو پەنجەرەکەی پاککردەوە، لەو کاتەشدا دوو کڕیار هاتنە ژوورێ و هەندێک کریستاڵیان کڕی.

کاتێ لەسڕینەوەیان تەواوبوو، داوای لەفرۆشیارەکە کرد خواردنی بداتێ. کریستاڵفرۆشەکە گوتی، «با بڕۆین نانی نیوەڕۆ بخۆین.»

هێمایەکی کرد بەدەرگاکەوە و ڕۆیشتن بۆ کافتریایەکی بچووکی ئەو نزیکانە.

گوتی، «پێویستی نەدەکرد یەک شت بکەیت. قورئان داوام لێدەکات خواردن بەکەسێکی برسی بدەم.»

کوڕەکە پرسی، «ئەی بۆ هێشتت پاکیان بکەمەوە؟»

«چونکە کریستاڵەکان پیس بوون. دەشبوو هەردووکمان مێشکمان لەبیرۆکەی نەرێنی پاک بکەینەوە.»

کاتێ نانیان خوارد، فرۆشیارەکە ڕووی بۆ کوڕەکە وەرگێڕا و گوتی، «دەمەوێ لەدوکانەکەمدا کار بکەیت. کاتێ ئیشتدەکرد دوو

کڕیار هاتن، ئەوەش پێشهاتێکی باشە.»

شوانەکە لەبیری خۆیدا گوتی، خەڵکی باسی پێشهات دەکەن. بەڵام خۆیشیان نازانن چی دەڵێن. هەر وەک ئەوەی چۆن بۆ ماوەی چەندین ساڵە نەمزانیووە بەزمانێکی بێ وشە لەگەڵ مەڕەکانمدا دەدوێم.

فرۆشیارەکە پرسی، «دەتەوێ کارم بۆ بکەی؟»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «دەتوانم تەواوی ڕۆژەکە کارت بۆ بکەم، دەتوانم شەو تا شەبەق کار بکەم، هەموو پارچە کریستاڵەکانی ناو دوکانەکەت پاکدەکەمەوە. لەبەرامبەریشدا، پارەم دەوێ تا سبەی بڕۆم بۆ میسر.»

فرۆشیارەکە پێکەنی. «ئەگەر تەواوی یەک ساڵ کریستاڵەکانم بۆ بسڕیتەوە ... ئەگەر پارەیەکی باش لەفرۆشتنی هەر پارچە کریستاڵێکدا وەربگری، هێشتا دەبێ بۆ گەیشتن بەمیسر پارە قەرز بکەی. هەزاران کیلۆمەتر بیابان لەنێوان ئێرە و ئەوێدا هەیە.»

ساتێکی هێندە بێدەنگی کاریگەر باڵی بەسەردا کێشان، هەر دەتگوت تەواوی شارەکە خەوتووە. دەنگ لەبازاڕەکە نەدەهات، فرۆشیارەکان قسەیان نەدەکرد، کەس بۆ نزاخوێندن بەقوللەکاندا هەڵنەدەزنا. بێ هیوا، بێ سەرکەشی، بێ پاشای پیر و چارەنووس، بێ سامان و بێ هەرەم. هەر دەتگوت تەواوی جیهان بێدەنگ بووە، چونکە نقە لەڕۆحی کوڕەکە بڕابوو. لەوێدا دانیشتبوو و تەماشای بەتاڵایی ناو دەرگای کافتریاکەی دەکرد، هیوای دەخواست لەو ساتەدا بمرێ و هەموو شتێ کۆتایی پێبێ.

فرۆشیارەکە بەنیگەرانی تەماشای کوڕەکەی کرد. هەموو ئەو شادییەی ئەو بەیانییە بینیبووی، لەناکاو نەما.

کریستاڵفرۆشەکە گوتی، «کوڕم، دەتوانم پارەت بدەمێ تا







بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت.»

کوڕەکە هیچی نەگوت. هەستا، جلەکانی ڕێکخست و جانتاکەی هەڵگرت.

گوتی، «کارت بۆ دەکەم.»

لە پاش ماوەیەکی درێژی تری بێدەنگی، ئەمەشی بۆ زیادکرد، «پێویستم بەپارەیە بۆ کڕینی چەند مەڕێک.»




نزیکەی مانگێک کوڕەکە کاری بۆ کریستاڵفرۆشەکە کرد و بۆیدەرکەوت ئەو کارە دڵخۆشی ناکا. تەواوی ڕۆژەکە فرۆشیارەکە لەپشتی مێزەکەوە منگەی دەهات، پێی دەگوت وریابێ و پارچە کریستاڵەکان نەشکێنێ.

گەر چی دوکاندارەکە پیرێکی بەسکالاش بوو، بەلام لەسەر کارەکەی مایەوە، چونکە بەباشی مامەڵەی لەگەڵ دەکرد؛ بڕێکی باشی بۆ فرۆشتنی هەر پارچە کریستاڵێک وەردەگرت و هەندێک پارەشی کۆکردبووەوە. ئەو بەیانییە کەمێک بیریکردەوە: ئەگەر هەموو ڕۆژێ بەو شێوەیە کاری بکردبا، ئەوا یەک ساڵی ڕێکی پێدەچوو تا پارەی تەواوی بەشی کڕینی هەندێک مەڕی کۆدەکردەوە.

کوڕەکە بەفرۆشیارەکەی گوت، «دەمەوێ پێشانگایەکی سندوقی بۆ کریستاڵەکان دروست بکەم. لەدەرەوە دایدەنێین، بەو شێوەیەش سەرنجی ئەوانە ڕادەکێشێ، کە بەخوارەوەی گردەکەدا تێدەپەڕن.»

دوکاندارەکە لەوەڵامدا گوتی، «هەرگیز پێشتر شتێکی لەو بابەتەم نەبووە. خەڵکی بەلایدا دەڕۆن و خۆیانی پیادەکێشن، بەو جۆرەش پارچە کریستاڵەکان دەشکێن.»

«کاتێ مەڕەکانم بۆ ناو کێڵگەکان دەبرد، هەندێکیان مردار دەبوونەوە ئەگەر مارێک پەیدا ببایە. بەلام ئەوە ژیانی شوان و مەڕە.»

فرۆشیارەکە ڕووی بۆ ئەو کڕیارە وەرگێڕا، کە دەیویست پەرداغی







کریستاڵ بکڕێ. لەهەموو کات فرۆشیی باشتربوو ... هەر دەتگوت کات گەڕاوەتەوە بۆ ئەو سەردەمەی شەقامەکە ڕێگەیەکی سەرەکی تانجیەر بوو.

لەپاش ڕۆیشتنی کڕیارەکە، بەکوڕەکەی گوت، «کار باشترە بووە. حاڵم باشترە و تۆش بەو نزیکانە دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆلای مەڕەکانت. بۆچی زیاتر لەژیان داوا دەکەیت؟»

«چونکە دەبێ وەڵامی پێشهاتەکان بدەینەوە.» کوڕەکە ئەمەی بەبێ مەبەست گوت؛ لەگوتنی پەشیمان بوو، چونکە هەرگیز دوکاندارەکە چاوی بەپاشاکە نەکەوتبوو.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «ئەوە پێی دەگوترێ سەرەتاکانی پێشهاتی باش، بەختی دەستپێکەر. چونکە ژیان دەیەوێ بەچارەنووسی خۆت بگەیت.»

بەڵام فرۆشیارەکە لەمەبەستی کوڕەکە تێگەیشت. کارکردنی کوڕەکە لەوێدا بۆخۆی پێشهاتێ بوو، لەپاش تێپەڕینی کات و پارە ڕژانە ناو چەکمەجەی حیسابەکەوە، لەهێنانی کوڕەکە پەشیمان نەبوو. کوڕەکە لەوە زیاتری وەردەگرت، کە شایانی بوو، چونکە کریستاڵفرۆشەکە پێی وابوو بەوە پارەیەکی زۆری لێ کەم نابێتەوە، هەر بۆیە بڕێکی باشی بەکوڕەکە دەبەخشی. دووپاتیکردبووەوە، کە بەو زووانە دەگەڕێتەوە بۆلای مەڕەکانی.

بۆ ئەوەی خۆی لەکاری پێشانگەکە بدزێتەوە، پرسی، «بۆچی دەتویست بچی بۆ هەرەمەکان؟»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «چونکە هەمیشە شتم لەسەر بیستوون،» هیچی لەبارەی خەونەکەیەوە نەگوت. ئێستا جگە لەیادەوەرییەکی بەئازار، سامانەکەی هیچی تر نەبوو، هەوڵیشیدەدا چیتر بیر لەوە نەکاتەوە.







فرۆشیارەکە گوتی، «کەس لێرە ناناسم بیەوێ تەواوی بیابانەکە بۆ بینیی هەرەمەکان ببڕێ. ئەوانە تەنیا کۆمەڵە بەردێکی لەسەر یەک داندراون. خۆشت دەتوانی لەحەوشەی خانووەکەتدا دانەیەک دروست بکەی.»

کوڕەکە گوتی، «هەرگیز خەونت بەگەشتکردنەوە نەبینیووە،» ڕووی بۆ کڕیارێک وەرگێرا، کە تازە چووبووە ناو دوکانەکەوە.

دوو ڕۆژ دواتر، فرۆشیارەکە لەبارەی پێشانگەکەوە لەگەڵ کوڕەکە دوا.

گوتی، «حەزم لەگۆڕانکاری زۆر نییە. من و تۆ وەک حەسەن نین، ئەو بازرگانێکی دەوڵەمەندە. ئەگەر هەڵەیەک لەکاری کڕیندا بکات، زۆر کاریگەری نابێ. بەڵام دەبێ ئێمە باجی هەڵەکانمان بدەین.»

کوڕەکە بەپەشیمانی لەبیری خۆیدا گوتی، ڕاستە.

«دەمەوێ زووتر بگەڕێمەوە بۆلای مەڕەکانم. کاتێ بەخت یاوەرمانە، دەمەوێ سوودی لێوەربگرین، هەرچیش بتوانم بۆ یارمەتیدانی بیکەم، هەر وەک چۆن ئەو بۆ یارمەتیدانمان دەیکا. ئەوە پێی دەگوترێ سەرەتاکانی پێشهاتی باش. یان بەختی دەستپێکەر.»

فرۆشیارەکە چەند خولەکێ هیچی نەگوت. پاشان گوتی، «پێغەمبەر قورئانی بۆ هێناوین و پێنج فەرزی بۆ دیاریکردووین، تا لەژیانماندا ئەنجامیان بدەین. گرنگترینیان بڕواکردنە بەخودایەکی تاک و تەنیا. ئەوانەی تریش، نوێژکردن پێنججار لەڕۆژێکدا، بەڕۆژووبوون لەڕەمەزان و خێرکردنە بەهەژاران.»

لەوێدا وەستا. کاتێ باسی پێغەمبەرەکەی دەکرد، چاوەکانی پڕبوون لەفرمێسک. پیاوێکی ئیماندار بوو، سەرەڕای نائارامییەکەشی،







دەیویست لەسەر یاساکانی ئیسلام بڕوات.

کوڕەکە پرسی، «پێنجەم فەرزیان چییە؟»

فرۆشیارەکە لەوەلامدا گوتی، «دوو ڕۆژ پێش ئێستا، گوتت هەرگیز خەونم بەگەشتکردنەوە نەبینیوە. پێنجەم فەرز بۆ هەموو ئیسلامێک، حەجکردنە. ئەگەر یەک جاریش لەژیانماندا بێ، ناچارین سەردانی شارە پیرۆزەکەی مەککە بکەین.

«مەککە زۆر لەهەرەمەکان دوورترە. کاتێ لاو بووم، هەموو ئەوەی دەمویست، پارەکۆکردنەوەبوو بۆ دروستکردنی ئەم دوکانە. پێم وابوو ڕۆژێک دەوڵەمەند دەبم و سەردانی مەککە دەکەم. هەندێک پارەم کۆکردەوە، بەلام هەرگیز نەمدەتوانی دوکانەکە بەسەر کەسێکدا بەجێ بهێڵم؛ کریستاڵ شتێکی ناسکە. لەو دەمەدا، تەواوی کاتەکان خەڵکی بەلای دوکانەکەمدا تێدەپەڕین و بەرەو مەککە دەڕۆیشتن. هەندێک لەحاجییەکان کەسانی دەوڵەمەند بوون، بەکاروانی گەورەوە، کە لەخزمەتکار و وشتر پێکهاتبوو، گەشتیاندەکرد، بەلام زۆرینەی ئەو خەڵکەی دەچوون بۆ حەج، لەمن هەژارتر بوون.

«هەموو ئەوانەی دەڕۆیشتن شادمان بوون. هێمای حاجییان بەدەرگای خانووەکانیانەوە هەڵدەواسی. یەکێک لەوان، کە پینەچیبوو و ژیانی لەسەر دروستکردنی پێڵاو دەگوزەراند، گوتی ماوەی ساڵێک بەبیاباندا گەشتیکردووە، بەلام هێشتاش پیاسەکردن بەشەقامەکانی تانجییەردا، بۆ کڕینی چەرم، ماندووتریکردووە.»

کوڕەکە پرسی، «ئەی بۆچی ناچیت بۆ مەککە؟»

«چونکە بیرۆکەی مەککە توانای ژیانم پێدەبەخشێ. هەر ئەوەشە یارمەتیم دەدات ڕووبەڕووی ئەم هەموو ڕۆژە دووبارەیە، کریستاڵە بێدەنگەکانی ناو ڕەفەکان و نانی نیوەڕۆ و ئێوارە لەهەمان کافتریای ناخۆش ببمەوە. دەترسم گەر خەونەکەم بێنمەدی، هیچ هۆکارێکی







دیکەم بۆ ژیان نەمێنێ.

«تۆ خەون بەمەڕەکانت و هەڕەمەکانەوە دەبینی، بەڵام جیاوازە، چونکە تۆ دەتەوێ خەونەکەت بهێنیتەدی. من تەنیا دەمەوێ خەون بەمەککەوە ببینم. هەزار جاران وێنای ئەوەم کردووە، کە بیابانەکە دەبڕم، دەگەمە گۆڕەپانی بەردە پیرۆزەکە، پاشان بەر لەوەی دەستی لێبدەم، حەوت جاران بەدەوریدا سووڕاوەمەتەوە. وێنای ئەوانەشم کردووە، کە بەتەنیشت و لەپێشمەوە دەبن، هەروەها وێنای ئەو گفتوگۆ و نزایانەشم کردووە، کە پێکەوە دەیانکەین. بەڵام دەترسم تەواوی شتەکە ببێتە هیوابڕانێک، بۆیە پێم باشترە تەنیا خەونی پێوە ببینم.»

ئەو ڕۆژە فرۆشیارەکە ڕێگەی بەکوڕەکەدا پێشانگەکە دابمەزرێنێ. بەو شێوەیەش هەموو خەڵکی پێیان وانەدەبوو خەونەکانی هاتوونەتە دی.



دوو مانگی تر تێپەڕی و پێشانگەکەش چەندین کڕیاری بۆ دوکانەکە ڕاکێشا. کوڕەکە مەزەندەیکرد، ئەگەر شەش مانگی تر بەو شێوەیە کاری بکردبا، دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئیسپانیا و شەست مەڕی تر بکڕێ، هەر وەک جاران شەست مەڕ. لەماوەی کەمتر لەساڵێکدا، دەیتوانی دوو هێندە مەڕ بکڕێ و بازرگانییش لەگەڵ عەرەبەکان بکات، چونکە ئێستا زمانە سەیرەکەیان فێربووبوو. لەو بەیانییەی بازاڕەکەوە ئوریم و توميمی بەکارنەهێنابوو، چونکە ئێستا میسر بۆ ئەو تەنیا خەونێکی دوور بوو، هەر وەک چۆن مەککە تەنیا خەونێکبوو بۆ فرۆشیارەکە. بەهەرحاڵ، کوڕەکە بەکارەکەی شادمان






بوو، هەموو کاتێکیش بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە، کە وەک براوەیەک دەگەیشتەوە تاریفە.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «دەبێ هەمیشە بزانی چیت گەرەکە.» کوڕەکە دەیزانی و ئێستاش هەوڵی بۆیدەدا. ڕەنگە گیرخواردنی کوڕەکە لەو زەوییە بێگانەیەدا، سامانی کوڕەکە بووبێ، کە چاوی بەدزێک کەوتبوو و دواتریش مێگەلەکەی دەکردە دوو ئەوەندە، بەبێ ئەوەی یەک دینار خەرج بکات.

شانازی بەخۆیەوە دەکرد. چەند شتێکی گرنگ فێربووبوو، وەک مامەڵەکردن لەگەڵ کریستاڵ و قسەکردن بەزمانێکی بێ وشە ... هەروەها فێری پێشهاتیش بووبوو. ڕۆژێک لەسەر گردەکە پیاوێکی بینی، سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە لەپاش بڕینی تەواوی ئەو ڕێگەیە، هیچ شوێنێکی لێ نییە شتێکی لێبخۆنەوە. کوڕەکەش کە شارەزای پێشهاتەکان بووبوو، قسەی لەگەڵ فرۆشیارەکە کرد.

«با چای بەو کەسانە بفرۆشین، کە بەسەر گردەکەدا هەڵدەزنێن.»

فرۆشیارەکە گوتی، «چەندین خەڵک لەم نزیکانە چای دەفرۆشن.»

«بەڵام دەتوانین لەپیاڵەی کریستاڵدا بیفرۆشین. خەڵکی حەزیان بەچایەکە دەبێ و دەیانەوێ پیاڵەکانیش بکڕن. پێم گوتراوە جوانی گەورەترین فریودەری مرۆڤە.»

فرۆشیارەکە هیچی نەگوت، بەڵام ئەو پاشنیوەڕۆیە، لەپاش کردنی نوێژەکانی، کوڕەکەی بانگهێشتکرد لەگەڵی دابنیشێ و پێکەوە نێرگیلە بکێشن، ئەو پایپە سەیرەی عەرەبەکان بەکاریان دەهێنا.

فرۆشیارە پیرەکە پرسی، «تۆ بەدووی چیدا دەگەڕێیت؟»

«پێشتر پێم گوتیت. پێویستە مەڕەکانم بکڕمەوە، بۆ ئەو

مەبەستەش، پێویستم بەپارەیە.»

کریستاڵفرۆشەکە هەندێک خەڵووزی نوێی خستە سەر نێرگیلەکە و بەتووندی مژی لێدا.

«سێ ساڵە خاوەنی ئەم دوکانەم. دەتوانم کریستاڵی باش لەخراپ جیابکەمەوە و هەموو شتێکی دیکەش لەبارەی کریستاڵەوە دەزانم. شارەزای ئەو ڕەهەندەم و دەزانم شێوازی مامەڵەی چۆنە. ئەگەر چای لەکریستاڵدا بفرۆشین، دوکانەکە فراوان دەبێ. بەو شێوەیەش دەبێ ڕاڕەوی ژیانم بگۆڕم.»

«جا ئەوە شتێکی باش نییە؟»

«تازە بەم شتانە ڕاهاتووم. بەر لەوەی تۆ بێیتە ئێرە، بیرم لەوە دەکردەوە، کە چەندەم کات لەهەمان ئەم شوێنەدا بەفیڕۆ داوە، لەکاتێکدا هاوڕێکانم لەگۆڕانکاریدا بوون، یان ئیفلاسیاندەکرد، یا لەپێشتر باشتر دەبوون. ئەوەیان زۆر نیگەرانیکردم. ئێستا بۆم دەردەکەوێ شتێکی زۆر خراپم نەکردووە. دوکانەکە ئەو قەبارەیەیە، کە هەمیشە ئارەزوویمکردووە. نامەوێ هیچ شتێ بگۆڕم، چونکە نازانم چۆن مامەڵە لەگەڵ گۆڕانکارییدا بکەم. بەم شێوە ژیانە ڕاهاتووم.»

کوڕەکە نەیدەزانی چی بڵێ. پیاوەکە بەردەوام بوو، «تۆ بەرەکەت بووی بۆ من. ئەمڕۆ لەشتێ تێگەیشتم، کە پێشتر نەمدەبینی: پشتگوێخستنی هەر بەرەکەتێ، دەبێتە نەفرین. هیچ شتێکی ترم لەژیاندا ناوێ. بەڵام وام لێدەکەیت چاو لەسامان بکەم و تەماشای ئەو ئاسۆیانە بکەم، کە هەرگیز شارەزایان نەبووم. ئێستاش کە بینیومن و ئەگەرە گەورەکان دەبینم، لەپێش گەیشتنی تۆ هەستم خراپترە. چونکە خۆم دەزانم دەتوانم چی بکەم، بەڵام نامەوێ بیانکەم.»







کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، باشبوو هیچم بەنانەواکەی تاریفە نەگوت.

لەگەڵ خۆرئاوابووندا، لەسەر کێشانی نێرگیلەکەیان بەردەوام بوون. بەعەرەبی گفتوگۆیاندەکرد و کوڕەکەش شانازی بەخۆیەوە دەکرد. ڕۆژێک لەڕۆژان پێی وابوو مەڕەکان بتوانن هەموو شتێکی لەبارەی جیهانەوە فێربکەن. بەڵام هەرگیز نەیاندەتوانی فێری عەرەبی بکەن.

کاتێ کوڕەکە تەماشای دوکاندارە پیرەکەی دەکرد، لەبیری خۆیدا گوتی، بەدڵنیاییەوە شتی دیکەش لەجیهاندا هەیە، کە مەڕەکان ناتوانن فێرم بکەن. هەموو ئەوەی ئەوان دەیانەوێ، تەنیا گەڕانە بەدووی خۆراک و ئاودا. ڕەنگە ئەوان ئەوەیشیان فێرنەکردبم، بەڵکو خۆم لەوانەوە فێربووبم.

لەکۆتاییدا فرۆشیارەکە گوتی، «مەکتوب.»

«یانی چی؟»

لەوەڵامدا گوتی، «دەبێ بەعەرەبی لەدایک ببی تا لەمانای ئەو وشەیە تێبگەی. بەڵام لەزمانەکەی تۆدا دەبێ بەنووسراو.»

لەکاتی دامرکاندنەوەی خەڵووزی سەر نێرگیلەکە، بەکوڕەکەی گوت دەتوانێ دەست بەفرۆشتنی چای بکا لەپیاڵەی کریستاڵدا. هەندێکجار هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ وەستاندنی ڕووبارەکە.



پیاوەکان بەگردەکەدا هەڵدەزنان و کاتێ دەگەیشتنە سەرەوە ماندوودەبوون. بەڵام لەوێ دوکانێکی کریستاڵیان دەبینی، کە بەچایی تازە خزمەتیان دەکرد. دەچوون بۆ خواردنەوەی چاییەکە،

کە لەپیاڵەی کریستاڵی جواندا پێشکەش دەکرا.

یەکێکیان گوتی، «هەرگیز ژنەکەم بیری لەمە نەکردووەتەوە،» پاشان هەندێک کریستاڵی کڕی - ئەو شەوە میوانی دەهات و میوانەکانیش سەریان لەپیاڵە شووشەکان سووڕدەما. پیاوێکی تریان ئاماژەی بەوەدا، کە هەمیشە چای لەکریستاڵدا بەتامترە، چونکە بۆنەکەی دەپارێزێ. پیاوی سێیەم گوتی، لەمەشرق نەریتە چای لەپیاڵەی کریستاڵدا بخورێتەوە، چونکە هێزێکی جادوویی هەیە.

زۆری بەسەردا تێنەپەڕی هەواڵەکە بڵاوبووەوە، خەڵکێکی زۆریش بەگردەکەدا هەڵدەزنان تا ئەو دوکانە کۆنە ببینن، کە شتێکی نوێیان پێشکەشدەکرد. دوکانەکانی دیکەش لەپیاڵەی کریستاڵدا دەستیان بەفرۆشتنی چای کرد، بەڵام ئەوان لەسەر لووتکەی گردێک نەبوون و کاریان باش نەبوو.

وردە وردە، دەبوو کریستاڵفرۆشەکە دوو شاگردی دیکەش بهێنێ. دەستی بەهێنانی بڕێکی زۆر چای کرد، لەگەڵ کریستاڵەکاندا، دوکانەکەش لەلایەن ئەو ژن و پیاوانەوە سەردانی دەکرا، کە تینوی بینینی شتی نوێ بوون.

بەو شێوەیەش مانگەکان تێپەڕین.



بەر لەکازیوە کوڕەکە بەئاگا هات. یانزە مانگ و نۆ ڕۆژ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیبوو، کە بۆ یەکەمجار پێی نابووە کیشوەری ئەفەریقاوە.

ئەو بەرگە عەرەبییەی لەبەرکردبوو، کە لەکەتانی سپی دروستکرابوو، بەتایبەت بۆ ئەو ڕۆژەی کڕیبوو. عەگالەکەی خستە







کە لەپیاڵەی کریستاڵی جواندا پێشکەش دەکرا.

یەکێکیان گوتی، «هەرگیز ژنەکەم بیری لەمە نەکردووەتەوە،» پاشان هەندێک کریستاڵی کڕی — ئەو شەوە میوانی دەهات و میوانەکانیش سەریان لەپیاڵە شووشەکان سووڕدەما. پیاوێکی تریان ئاماژەی بەوەدا، کە هەمیشە چای لەکریستاڵدا بەتامترە، چونکە بۆنەکەی دەپارێزێ. پیاوی سێیەم گوتی، لەمەشرق نەریتە چای لەپیاڵەی کریستاڵدا بخورێتەوە، چونکە هێزێکی جادوویی هەیە.

زۆری بەسەردا تێنەپەڕی هەواڵەکە بڵاوبووەوە، خەڵکێکی زۆریش بەگردەکەدا هەڵدەزنان تا ئەو دوکانە کۆنە ببینن، کە شتێکی نوێیان پێشکەشدەکرد. دوکانەکانی دیکەش لەپیاڵەی کریستاڵدا دەستیان بەفرۆشتنی چای کرد، بەڵام ئەوان لەسەر لووتکەی گردێک نەبوون و کاریان باش نەبوو.

وردە وردە، دەبوو کریستاڵفرۆشەکە دوو شاگردی دیکەش بهێنێ. دەستی بەهێنانی بڕێکی زۆر چای کرد، لەگەڵ کریستاڵەکاندا، دوکانەکەش لەلایەن ئەو ژن و پیاوانەوە سەردانی دەکرا، کە تینوی بینینی شتی نوێ بوون.

بەو شێوەیەش مانگەکان تێپەڕین.



بەر لەکازیوە کوڕەکە بەئاگا هات. یانزە مانگ و نۆ ڕۆژ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیبوو، کە بۆ یەکەمجار پێی نابووە کیشوەری ئەفەریقاوە.

ئەو بەرگە عەرەبییەی لەبەرکردبوو، کە لەکەتانی سپی دروستکرابوو، بەتایبەت بۆ ئەو ڕۆژەی کڕیبوو. عەگالەکەی خستە






سەری و بەو بازنەیە قایمیکرد، کە لەپێستی وشتر دروستکرابوو. پاپووچەکانی لەپێکرد و بەهێواشی بەپلیکانەکاندا ڕۆیشتە خوارێ.

هێشتا شارەکە خەوتبوو. لەفەیەکی بۆخۆی دروستکرد و چایی لەپیاڵەی کریستاڵدا خواردەوە. ئەوجا لەبەردەم دەرگا بەخۆر گرتووەکەدا دانیشت و نێرگیلەی دەکێشا.

بەبێ دەنگی دەیکێشا و بیری لەهیچ نەدەکردەوە، گوێی لەدەنگی ئەو بایە دەگرت، کە بۆنی بیابانەکەی دەهێنا. کاتێ لەکێشانی نێرگیلەکە تەواوبوو، دەستی بەیەکێک لەگیرفانەکانیدا کرد، بۆ ساتێک پەشیمانبوو لەوەی دەریهێنابوو.

سەفتەیەک پارەبوو. بەشی ئەوەی دەکرد سەد و بیست مەڕ، بلیتێکی گەڕانەوە و مۆڵەتێک بۆ هاوردەکردنی شمەک لەئەفەریقاوە بۆ وڵاتەکەی خۆی بکرێ.

بەئارامی چاوەڕێ بوو فرۆشیارەکە بەئاگا بێتەوە و دوکانەکە بکاتەوە. ئەوجا هەردووکیان ڕۆیشتن تا کەمێک چایی تر بخۆنەوە.

کوڕەکە گوتی، «ئەمڕۆ دەڕۆم. بەشی ئەوەم پارە پێیە مەڕەکانم بکڕمەوە. تۆش بەشی ئەوەت پێیە سەردانی مەککە بکەیت.»

پیرەپیاوەکە هیچی نەگوت.

کوڕەکە پرسی، «نزام بۆ دەکەیت؟ تۆ یارمەتیت دام.» پیاوەکە لەسەر ئامادەکردنی چاییەکەی بەردەوام بوو، هیچی نەدەگوت. ئەوجا ڕووی بۆ کوڕەکە وەرگێڕا.

گوتی، «شانازیت پێوە دەکەم. هەستێکی نوێت هێنایە ناو دوکانی کریستاڵەکەمەوە. بەڵام خۆت دەزانی ناچم بۆ مەککە. هەر وەک چۆن تۆش مەڕەکانت ناکڕیتەوە.»

کوڕەکە بەترسەوە گوتی، «کێ ئەوەی پێگوتیت؟»

پیرە کریستاڵفرۆش گوتی، «مەکتوب.»

ئەوجا نزای بۆ کوڕەکە کرد.



کوڕەکە ڕۆیشتە ژوورەکەی و شتەکانی کۆکردەوە. سێ جانتای پڕکرد. کاتێ ڕۆیشت، لەسووچێکی ژوورەکەدا چاوی بەجانتای شوانییەکەی کەوت. گرمۆڵە بووبوو و دەمێکیشبوو بیری لێی نەکردبووەوە. کاتێ چاکەتەکەی دەرهێنا و بیری لەوە دەکردەوە لەسەر شەقام بیدات بەکەسێک، دوو بەردەکە کەوتنە خوارێ بۆ سەر زەوییەکە. ئوریم و تومیم.

ئەوەیش وای لەکوڕەکە کرد بیر لەپاشا پیرەکە بکاتەوە، لەوەش دەترسا، کە ماوەیەکی درێژبوو ئەوی بەخەیاڵ نەهاتبوو. ماوەی ساڵێک بەبەردەوامی کاریکردبوو و تەنیا بیری لەکۆکردنەوەی پارە کردبووەوە، تا بەو شێوەیەش بەشانازییەوە بگەڕێتەوە بۆ ئیسپانیا.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «هەرگیز واز لەخەونبینین مەهێنە. دوای پێشهاتەکان بکەوە.»

کوڕەکە ئوریم و تومیمی هەڵگرتەوە و جارێکی دیکە ئەو هەستە سەیرەی لا دروستبوو، کە پاشا پیرەکە لەنزیکیەوەیەتی. ماوەی ساڵێک کاری زەحمەتی کردبوو و پێشهاتەکانیش دەیانگوت کاتی ڕۆیشتنە.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، دەست دەکەمەوە بەوەی هەمیشە خەریکی بووم. گەر چی مەڕەکان فێری عەرەبیشیان نەکردبوو. بەڵام مەڕەکان شتێکی گرنگیان فێرکردبوو؛ کە گوایا زمانێک هەیە و هەموو کەسێکی جیهان لێی تێدەگات، زمانێک، کە لەپێشخستنی کارەکانی دوکانەکەدا بەکاری هێنا. ئەو زمانە، زمانی پەرۆشی بوو،







زوبانی تەواوکردنی شتەکانبوو بەخۆشەویستی و ئامانجەوە، هەروەها بەشێکبوو لەگەڕان بەدووی شتێکدا، کە خۆت باوەڕی پێبکەیت و ئارەزووی بکەیت. ئیدی تانجیەر شارێکی نامۆ نەبوو، هەر چۆن توانیبووی لەم شوێنەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، ئاوهاش دەیتوانی لەتەواوی جیهاندا سەرکەوتوو بێ.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «کاتێ شتێکت گەرەکە، تەواوی جیهان لەدەستخستنیا یارمەتیت دەدات.»

بەلام پاشا پیرەکە هیچی لەبارەی دزی، یا لەبارەی بیابانی نەبڕاوە، یاخود لەسەر ئەو کەسانە نەگوتبوو، کە دەیانزانی خەونەکانیان چین و نایانەوێ بەدیان بهێنن. پاشا پیرەکە پێی نەگوتبوو هەڕەمەکان تەنیا کۆمەڵە بەردێکی لەسەر یەک دانراون و هەموو کەسێک دەتوانێ لەحەوشەکەی ماڵی خۆیدا دانەیەک دروست بکات. لەیادیشیکردبوو بڵێ، کە هەرکات پارەت پێبوو تا ڕانەمەڕێکی لەوەی خۆت گەورەتر بکڕی، دەبێ بیکڕی.

کوڕەکە جانتاکەی هەڵگرت و لەگەڵ شتەکانی تر دایناـ. بەپلیکانەکاندا ڕۆیشتە خوارێ و بینی دوکاندارەکە بە ژن و پیاوێکی بێگانەوە سەرقاڵە، لەهەمان کاتیشدا دوو کڕیار بەرەو دوکانەکە دەڕۆیشتن و چاییان لەپیاڵەی کریستاڵدا دەخواردەوە. لەم ساتەی بەیانییدا، لەکاتەکانی دیکە چالاکی زیاتر هەبوو. لەو شوێنەی لێی وەستابوو، بۆ یەکەمجار تێبینیکرد قژی کریستاڵفرۆشەکە زۆر لەقژی پاشا پیرەکە دەچێ. خەندەی شیرینیفرۆشەکەی بیرکەوتەوە، ئەو کاتەی بۆ یەکەمجار هاتبووە تانجیەر، کە هیچی نەبوو بیخوات و هیچ شوێنێکی نەبوو بۆی بچێ — ئەو بزەیەش لەهی پاشا پیرەکە دەچوو.

لەبیری خۆیدا گوتی، هەر دەڵێی پێشتر لێرەبووە و نیشانەی







خۆی بەجێ هێشتووە. هێشتاش، هیچ کام لەو کەسانە چاویان بەپاشا پیرەکە نەکەوتبوو. بەشێوەیەک لەشێوەکان گوتبووی، ئەو هەمیشە بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانە دەردەکەوێ، کە دەیانەوێ بەچارەنووسی خۆیان بگەن.

بەبێ ئەوەی ماڵئاوایی لەکریستاڵفرۆشەکە بکات، ڕۆیشت. نەیدەویست لەبەرچاوی ئەو خەڵکەی ئەوێدا بگری. لەداهاتوودا بیری ئەو شوێنە و هەموو ئەو شتانەی دەکرد، کە فێریان بووبوو. زیاتر بڕوای بەخۆیبوو و پێشی وابوو بتوانێ جیهان ببەزێنێ.

بەدڵنیاییەوە بەخۆی گوت، «دووبارە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کێڵگانەی پێیان ئاشنام، تا دیسان ئاگاداری مێگەلەکەم بم،» بەڵام ئیدی بەو بڕیارەی دڵخۆش نەبوو. ساڵێکی ڕەبەق بۆ هێنانەدی خەونەکەی کاریکردبوو، گرنگی ئەو خەونەش خولەک بەخولەک کەمتر دەبووەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ، کە بەجیدی ئەوە خەونی خۆی نەبووە.

کێ دەزانێ ... ڕەنگە وا باشتربێ وەک کریستاڵفرۆشەکە بێ: لەبیری خۆیدا گوتی، هەرگیز ناچێ بۆ مەککە و لەژیانیشدا تەنیا ئاواتی بۆ دەخوازێ، دەیویست دیسان خۆی قایل بکات. بەڵام هەر کە ئوریم و تومیمی بەدەستەوە گرت، هێز و ویستی پاشا پیرەکەی بۆ گەڕایەوە. بەڕێکەوت – یان کوڕەکە پێی وابوو پێشهات بێ – چوو بۆ ئەو بارەی لەیەکەم ڕۆژدا سەردانیکردبوو. دزەکە لەوێ نەبوو و خاوەنی بارەکەش چاییەکی بۆ هێنا.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، هەمیشە دەتوانم ببمەوە بەشوان. فێربووم چۆن ئاگام لەمەڕەکان بێ و لەبیریشم نەچووەتەوە. بەڵام ڕەنگە جارێکی تر بواری ئەوەم نەبێ سەردانی هەڕەمەکانی میسر بکەم. پیرەپیاوەکە سینەبەندێکی ئاڵتوونی بەستبوو و شارەزای







ڕابردووشم بوو. هەر بەڕاستی ئەو پاشا بوو، پاشایەکی زرنگ.

کێڵگەکانی ئەندەلوسیا تەنیا دوو کاتژمێر دووربوون، بەڵام تەواوی بیابانێک لەنێوان ئەو و هەڕەمەکاندا هەبوو. هێشتا کوڕەکە هەستیدەکرد ڕێگەیەکی تر هەیە بۆ ڕێزگرتن لەدۆخەکەی: لەڕاستیدا دوو کاتژمێر لەسامانەکەی نزیکتربوو ... ئەو ڕاستییەی دوو کاتژمێر بۆ ساڵێک درێژ بووبووەوە، گرنگ نەبوو.

لەبیری خۆیدا گوتی، دەزانم بۆچی دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ لای مێگەلەکەم. لەمەڕ تێدەگەم؛ ئیدی ئەوان کێشە نین و دەتوانن ببنە هاوڕێی باش. بەجۆرێکی تر، نازانم گەر بیابانەکە بتوانێ ببێتە هاوڕێت، دەشبێ لەبیابانەکەدا بۆ سامانەکەم بگەڕێم. ئەگەر نەیدۆزمەوە، هەمیشە دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ نیشتمان. بۆ نا؟

لەناکاو هەستی بەشادییەکی مەزن کرد. هەمیشە دەیتوانی ببێتەوە بەشوان. هەمیشە دەیتوانی ببێتەوە بەکریستاڵفرۆش. ڕەنگە جیهان سامانی دیکەی نهێنی تێدا هەبێ، بەڵام ئەو خەونی بینیبوو و چاوی بەپاشایەکیش کەوتبوو. ئەوە بەسەر هەموو کەسێکدا نایەت.

کاتێ لەبارەکە ڕۆیشت، پلانی دادەنا. بیری کەوتەوە یەکێک لەبازرگانەکانی کریستاڵ، بەکاروان کریستاڵەکانی لەبیابانەکە دەپەڕاندەوە. ئوریم و تومیمی لەدەستیدا گرتبوو؛ لەبەر ئەو دوو بەردە، جارێکی تر بەڕێوەبوو بەرەو سامانەکەی.

پاشا پیرەکە پێی گوتبوو، «هەمیشە لەو کەسانە نزیکم، کە دەیانەوێ بەچارەنووسی خۆیان بگەن.»

چی تێدەچوو ئەگەر بڕۆشتبا بۆ ماڵی ئەو بازرگانی کریستاڵە و بیپرسیبا گەر هەر بەڕاستی هەڕەمەکان هێندە دووربن.









پیاوە ئینگلیزەکە لەو شوێنەی لەسەر کورسییەکە لێی دانیشتبوو، بۆنی ئاژەڵ و عارەق و خۆڵی لێدەهات؛ بەشێکی عەمبار و بەشێکی تەویلە بوو. کاتێک پەڕەی نامیلکەیەکی کیمیای هەڵدەدایەوە، لەبیری خۆیدا گوتی، هەرگیز پێم وانەبوو بگەمە شوێنێکی ئاوها. دە ساڵان لەزانکۆ و ئێستاش لەتەویلەیەکدام.

بەڵام دەبوو بەردەوام بێ. بڕوای بەپێشهات هەبوو. تەواوی سەرنج و دۆزینەوەی بۆ زمانێکی ڕاستەقینەی جیهان بوو. یەکەمجار ئیسپرانتۆو، پاشان ئایینەکانی جیهان، دواتریش کیمیا. دەیزانی بەزمانی ئیسپرانتۆو بدوێ و لەئایینە سەرەکییەکانی جیهان تێگەیشتبوو، بەڵام هێشتا نەبووبوو بەکیمیاگەر. ڕاستی پشتەوەی چەند پرسیارێکی گرنگی دەرخستبوو، بەڵام خوێندنەکەی گەیاندبوویە خاڵێک، کە وادەردەکەوت لەپشتی توانای خۆیەوە بێ. بێسوودانە هەوڵی دابوو پەیوەندی لەگەڵ کیمیاگەرێکدا دروست بکات. بەڵام کیمیاگەرەکان خەڵکانی سەیر بوون، تەنیا بیریان لەخۆیان دەکردەوە و ڕەتیاندەکردەوە یارمەتی ئەو بدەن. کێ دەزانێ، ڕەنگە لەدۆزینەوەی کاری ناوازە — بەردی فەیلەسوف — دا شکستیان هێنابێ، هەر بۆیە زانیارییەکانیان نادەن بەکەس.

پارەیەکی زۆری لەو سامانەدا خەرجکردبوو، کە لەباوکییەوە بۆیمابووەوە، بێبەرهەم بۆ بەردی فەیلەسوف دەگەڕا. کاتێکی زۆری لەکتێبخانە گەورەکانی جیهاندا بەفیڕۆ دابوو و هەموو کتێبە دەگمەنەکانی بواری کیمیای کڕیبوو. لەیەکێک لەو کتێبانەدا خوێندبوویەوە، کە ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا، کیمیاگەرێکی عەرەب سەردانی ئەورووپای کردبوو. دەگوترێ تەمەنی ئەو پیاوە دوو سەد ساڵ زیاتر بووە، بەردی فەیلەسوف و نەمری ژیانی دۆزیبووەوە.







ئەو چیرۆکە زۆر کاری لەپیاوە ئینگلیزەکە کردبوو. بەڵام تەنیا وەک ئەفسانەیەک تەماشایدەکرد، خۆ هاورێیەکی خۆی — لەگەشتێکی شوێنەوارناسی بیابانەکەوە نەگەڕاوەتەوە — و باسی ئەو عەرەبەی بۆ نەکردووە، کە هێزی سەروو ئاسایی هەیە.

هاورێکەی گوتبووی، «لە مێرگی ئەلفەیوم دەژی. خەڵکی دەڵێن دوو سەد ساڵی تەمەنە و دەتوانێ هەر جۆرە کانزایەک بگۆڕێ بەئاڵتوون.»

پیاوە ئینگلیزەکە نەیدەتوانی درێژە بەپەرۆشییەکەی بدات. هەموو ئەرکەکانی وەلانابوو و گرنگترینی کتێبەکانی خۆی کۆکردبووەوە، ئەوەتا ئێستا لێرەدا، لەم عەمبارە پڕ لەبۆن و تۆزەدا دانیشتووە. لەدەرەوە کاروانێکی گەورە ئامادەکراوە تا لەسەحرا بپەڕێتەوە، بەنیازیشبوو بەئەلفەیومدا تێبپەڕێ.

پیاوە ئینگلیزەکە لەبیری خۆیدا گوتی، دەبێ ئەو کیمیاگەرە نەفرەتییە بدۆزمەوە. بۆنی ئاژەڵەکان کەمێک لەبەر لووتیدا باشتربوو.

پیاوێکی عەرەبیش بەشمەکەکانیەوە هات و سڵاوی لەپیاوە ئینگلیزەکە کرد.

عەرەبە لاوەکە پرسی، «بەرەو کوێ دەڕۆی؟»

پیاوەکە لەوەڵامدا گوتی، «بەرەو بیابانەکە.» پاشان دەستی بەخوێندنەوە کردەوە. لەو شوێنەدا حەزی بەهیچ جۆرە گفتوگۆیەک نەبوو. هەموو ئەوەی پێویستی بوو، ئەوەبوو چاوێ بەو شتانەدا بخشێنێتەوە، کە لەو ساڵانەدا فێریان بووبوو، بەدڵنیاییەوە کیمیاگەرەکە تاقیکردنەوەی پێدەکرد.

لاوە عەرەبەکە کتێبێکی دەرهێنا و دەستی بەخوێندنەوەیکرد. کتێبەکە بەئیسپانی نووسرابوو. ئینگلیزەکە لەبیری خۆیدا گوتی، زۆر باشە. ئیسپانی لەعەرەبی باشتر دەزانێ، بەو شێوەیە گەر







ئەویش بێ بۆ ئەلفەیوم، ئەوا ئەگەر هیچ شتێکی گرنگتر نەبێ، کەسێ دەبێ دەمەتەقەی لەگەڵدا بکەم.



کاتێ دووبارە هەوڵیدا پرۆسەی بەخاکسپاردنەکە لەدەستپێکی کتێبەکەدا بخوێنێتەوە، کوڕەکە گوتی، «سەیرە. دوو ساڵە دەمەوێ ئەم کتێبە بخوێنمەوە، کەچی هێشتا لەم لاپەڕەیە تەواو نەبووم.» تەنانەت بەبێ ئەوەی پاشایەکیش خوێندنەوەکەی لێتێکبدات، نەیدەتوانی بەردەوام بێ.

هێشتا کەمێک گومانی لەبڕیارەکەی هەبوو. بەڵام دەیتوانی شتێک تێبگات: بڕیاردان تەنیا سەرەتای شتەکانە. کاتێ کەسێ بڕیار دەدات، خۆی دەداتە دەم تەوژمێکی بەهێز و بەرەو شوێنگەلێکی دەبات، کە هەرگیز لەکاتی بڕیاردانەکەدا پێی وانەبووە بەو شوێنانە بگات.

لەبیری خۆیدا گوتی، کاتێ بڕیارمدا بۆ سامانەکەم بگەڕێم، هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە لەدوکانێکی کریستاڵدا کار بکەم. ڕەنگە بەشداریم لەم کاروانەشدا بڕیاری خۆم بووبێ، بەڵام ئەوەی بەرەو کوێ دەڕوات، بۆ منیش نهێنییە.

پیاوە ئینگلیزەکە لەنزیکیەوە بوو، کتێبێکی دەخوێندەوە. کەسێکی داخراوە و بێزاریش دەردەکەوت کاتێ کوڕەکە هاتە ژوورێ. دەشیا ببن بەهاوڕێ، بەڵام پیاوە ئینگلیزەکە کۆتایی بەگفتوگۆکە هێنا.

کوڕەکە کتێبەکەی داخست. هەستیدەکرد نایەوێ یەک شت بکا، کە لەهی پیاوە ئینگلیزەکە بچێ. ئوریم و تومیمی لەگیرفانی







دەرهێنا و یاری پێدەکردن.

بێگانەکە هاواریکرد، «ئوریم و تومیم!»

کوڕەکە بەخێرایی خستنیەوە گیرفانی.

گوتی، «نایانفرۆشم.»

پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «هێندە بەنرخ نین. تەنیا لەبەردی کریستاڵی دروستکراون و ملیۆنان بەردی کریستاڵی لەسەر زەوی هەیە. بەڵام کەسێ شارەزابێ، دەزانێ ئەوانە ئوریم و تومیمن. نەمدەزانی ئەو بەردانە لەم بەشەی جیهانیشدا بوونیان هەیە.»

کوڕەکە گوتی، «پاشایەک بەدیاری پێی بەخشیم.»

بێگانەکە هیچی نەگوت، لەجێی ئەوە، دەستی بەگیرفانیدا کرد و دوو بەردی وەک ئەوەی کوڕەکەی دەرهێنا.

گوتی، «گوتت پاشا؟»

حەزیدەکرد کۆتایی بەگفتوگۆکە بهێنێ و گوتی، «دەزانم پێت وانییە پاشایەک لەگەڵ کەسێکی وەک من قسە بکات، لەگەڵ شوانێکدا.»

«بە هیچ شێوەیەک وانییە. یەکەمجار شوانەکان پاشایان قبوڵکرد، لەکاتێکدا تەواوی جیهان ڕەتیاندەکردەوە. لەبەر ئەوەش هیچ سەرسوڕهێنەر نییە گەر پاشا لەگەڵ شواندا بدوێ.»

ئەوجا بەردەوام بوو، دەترسا کوڕەکە لەقسەکانی تێنەگات، «لە ئینجیلدا باسی ئەوە کراوە. هەر ئەو کتێبەش بوو بەئوریم و تومیم ئاشنایکردم. ئەم بەردانە تاکە فۆرمی پێشبینین، کە لەلایەن خوداوە ڕێگەیان پێدرابێ. قەشەکان لەسینەبەندێکی ئاڵتوونیدا هەڵیاندەگرن.»

لەناکاو کوڕەکە شادمانبوو بەوەی چووبووە عەمبارەکەوە.

پیاوە ئینگلیزەکە بەدەنگێکی کەمێک بەرز گوتی، «ڕەنگە ئەمە







پێشهات بێ.»

لەو ساتەدا کوڕەکە زیاتر بایەخی بەبابەتەکە دا، «کێ باسی پێشهاتی بۆ کردووی؟»

پیاوە ئینگلیزەکە ئەو نامیلکەیەی داخست، کە دەیخوێندەوە و گوتی، «هەموو شتێک لەژیاندا پێشهاتە. زمانێکی گەردوونی هەیە، کە هەموو کەسێ لێی تێدەگا، بەلام لەیاد کراوە. بۆ ئەو زمانە گەردوونییە و هەندێک شتی دیکە دەگەڕێم. هەر بۆ ئەو مەبەستەش لێرەم. دەبێ ئەو پیاوە بدۆزمەوە، کە ئەو زمانە گەردوونییە دەزانێ. کیمیاگەرێکە.»

سەرۆکی عەمبارەکە گفتوگۆکەی پێبڕین.

عەرەبە قەڵەوەکە گوتی، «ئەو دووانەتان بەختتان هەیە. ئەمڕۆ کاروانێک بەرەو ئەلفەیوم بەڕێدەکەوێ.»

کوڕەکە گوتی، «بەلام من دەچم بۆ میسر.»

عەرەبەکە گوتی، « ئەلفەیوم لەمیسرە. تۆ چ جۆرە عەرەبێکی؟»

لەپاش ئەوەی عەرەبە قەڵەوەکە ڕۆیشتە دەرێ، پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «ئەوە پێشهاتی بەختە. ئەگەر دەمتوانی، یەک کتێبی بانکی زانیارییم لەسەر وشەی بەخت و ڕێکەوت دەنووسی. زمانە جیهانییەکە بەو وشانە نووسراوە.»

بەکوڕەکەی گوت بینینی ئەو دووانە، لەکاتێکدا ئوریم و تومیم بەدەستی کوڕەکەوە بوون، ڕێکەوت نەبوو. لەکوڕەکەی پرسی گەر ئەویش بەدووی کیمیاگەرەکەدا بگەڕێ.

کوڕەکە گوتی، «بۆ سامانێک دەگەڕێم،» یەکراست لەگوتنی ئەوە پەشیمان بووەوە. بەلام وادەردەکەوت پیاوە ئینگلیزەکە هیچ بەلایەوە گرنگ نەبێ.

گوتی، «بەشێوەیەک لەشێوەکان، منیش هەر بەهەمان شێوەم.»







کاتێ سەرۆکی عەمبارەکە بانگیکردنە دەرێ، کوڕەکە گوتی، «هەر ناشزانم کیمیا چییە.»



پیاوە چاوڕەشە ڕیشنەکە گوتی، «من ڕابەری ئەم کاروانەم. هێزی ژیان و مەرگی ئەو کەسانەم لەدەستدایە، کە لەگەڵ خۆمیان دەبەم. بیابانەکە خانمێکی ڕاڕایە و هەندێکجار پیاوان شێتگیر دەکات.»

نزیکەی دوو سەد کەس و چوار سەد ئاژەڵ لەوێدا کۆببووبوونەوە — وشتر و ئەسپ و هێستر و باڵندە. لەناو جەنجاڵییەکەدا، ژنان و منداڵان و هەندێک پیاوی لێبوون، کە شمشێریان بەپشتێنەکانیانەوە کردبوو و تفەنگیان لەشانکردبوو. پیاوە ئینگلیزەکە چەند جانتایەکی پڕ لەکتێبی پێبوو. ژاوەژاو دەهات، بەو شێوەیەش دەبوو ڕابەرەکە چەندجارێک قسەکانی دووبارە بکاتەوە تا هەمووان تێبگەن.

«چەندین کەس لێرەیە و هەرکەسەش خودای خۆی هەیە. بەڵام تاکە خودا، کە من بڕوای پێبکەم، ئەڵڵایە و سوێندی پێدەخۆم هەرچییەک بتوانم بیکەم تا بەپارێزراوی لەبیابانەکە بتانپەڕێنمەوە. بەڵام دەمەوێ هەر یەک لەئێوەش سوێند بەخودای خۆتان بخۆن، کە بەبێ گوێپێدان، هەموو فەرمانەکان جێبەجێ بکەن. لەبیاباندا، لەقسەدەرچوون واتا مەرگ.»

منگەمنگێک لەجەنجاڵییەکەوە دەهات. هەرکەسە بەهێواشی سوێندی بەخودای خۆی دەخوارد. کوڕەکەش سوێندی بەعیسای مەسیح خوارد. پیاوە ئینگلیزەکە هیچی نەگوت. بۆڵەبۆڵەکەش لەسوێندخواردنێکی سادە زیاتری خایاند. خەڵکی لەئاسمانەکانیش







دەپاڕانەوە تا پارێزگارییان لێبکەن.

دەنگێک لەکەڕەنایەکەوە دەرچوو و هەمووان هەستانە سەر پێ. کوڕەکە و پیاوە ئینگلیزەکە وشتریان هێنابوو و بەگومانەوە سواری پشتیان بوون. کوڕەکە بەزەیی بەوشتری پیاوە ئینگلیزەکەدا دەهاتەوە، چونکە ئەو هەموو جانتا کتێبەی هەڵگرتبوو.

پیاوە ئینگلیزەکە ئەو گفتوگۆیەی دامەزراندەوە، کە لەعەمبارەکە پێیان بڕدرابوو، گوتی، «هیچ شتێ وەک ڕێکەوت نییە. من لەبەر ئەوە لێرەم، چونکە هاوڕێیەکم باسی عەرەبێکی بۆ کردم، کە ...»

کاروانەکە دەستیکرد بەجووڵە و زەحمەتبوو قسەکانی پیاوە ئینگلیزەکە ببیستێ. کوڕەکە دەیزانی دەیەوێ باسی چی بکات: ئەو زنجیرە نهێنییەی شتەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، هەمان ئەو زنجیرەیە وای لەو کرد ببێتە شوان، وایکرد چەندجارێک هەمان خەون ببینێ، هێنای بۆ شارێکی نزیکی ئەفەریقا، وایکرد پاشایەک بدۆزێتەوە و دزی لێبکرێ تا کریستاڵفرۆشەکە ببینێ، هەروەها ...»

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، مرۆڤ چەندێک لەگەیشتن بەچارەنووسی خۆی نزیک بکەوێتەوە، هێندە زیاتر چارەنووسی دەبێتە هۆکاری ژیانی.

کاروانەکە بەرەو خۆرهەڵات کەوتە ڕێ. بەیانی زوو دەستی بەگەشتکردن کرد، کاتێ خۆرەکە لەوپەڕی گەرمییدابوو وەستا و پاشان لەپاشنیوەڕۆدا دەستیان بەڕۆیشتن کردەوە. کوڕەکە بەدەگمەن لەگەڵ پیاوە ئینگلیزەکە قسەیدەکرد، چونکە زۆرینەی کاتەکانی بەخوێندنەوەی کتێبەکانییەوە بەسەردەبرد.

کوڕەکە بەبێدەنگی تێبینی بەردەوامبوونی ئاژەڵەکان و خەڵکەکەی دەکرد لەبیابانەکەدا. ئێستا هەموو شتێ لەو کاتە جیاواز بوو، کە دەستیان بەگەشتەکە کرد: سەریان لێتێکچووبوو و هاواریاندەکرد،

گریانی منداڵەکان و لوورەی ئاژەڵەکان، تەواوی ئەو شتانەش لەگەڵ فەرمانە شڵەژاوەکانی بازرگانەکان و ڕابەرەکاندا تێکەڵ بووبوون.

بەڵام لەبیابانەکەدا تەنیا دەنگی بایە نەبڕاوەکە و سمی ئاژەڵەکان دەهات. تەنانەت ڕابەرەکانیش بەکەمی لەگەڵ یەکدا دەدوان.

شەوێک وشترسوارێک گوتی، «چەندینجار بەم لمەدا ڕۆیشتووم. بەڵام بیابانەکە زۆر گەورەیە و ئاسۆش گەلێک دوورە، ئەمەش وادەکات مرۆڤ هەست بەبچووکی خۆی بکا و حەزبکات بەبێدەنگی بمێنێتەوە.»

کوڕەکە ڕێک لەمەبەستی تێگەیشت، بەبێ ئەوەی پێشتریش هاتبێتە ناو بیابانەکەوە. هەرکات ئاو و ئاگری دەبینی بێدەنگ دەبوو، توخمە هێزەکەیان کاری لێیدەکرد.

لەبیری خۆیدا گوتی، لەمەڕ و کریستاڵەکان شت فێربووم. دەتوانم شتێکیش لەبیابانەکە فێرببم. دێرین و ژیر دەردەکەوێ.

بایەکە نەدەوەستا و کوڕەکەش ئەو ڕۆژەی بەبیرکەوتەوە، کە پێی نایە قەڵاکەی تاریفە، ئەو ڕۆژەش هەمان با هەڵیکردبوو. خووری مەڕەکانی بەبیر دەخستەوە ... ئەو مەڕانەی وەک هەمیشە، ئێستاش لەکێڵگەکانی ئەندەلوسیادا بۆ خۆراک و ئاو دەگەڕێن.

بەبێ ئەوەی بیریان بکات، بەخۆی گوت، «ئیدی مەڕی من نین. ئەڵبەتە ئێستا بەشوانە نوێکەیان ڕاهاتوون و منیان لەبیرکردووە. شتێکی باشە. مەخلوقی وەک مەڕ فێری گەشتن و دەزانن چۆن بەردەوام بن.»

بیری لەکچی بازرگانەکە کردەوە و دڵنیابوو لەوەی ئێستا شوویکردووە. ڕەنگە هاوسەرگیری لەگەڵ نانەوایەک کردبێ، یان لەگەڵ شوانێکی تر، کە خوێندەواری هەیە و دەتوانێ چیرۆکی نایابی بۆ بگێڕێتەوە — پاش هەموو شتێکیش، ئەو تاکە کەس

نەبوو. بەڵام چالاکبوو بەوەی لەئاماژەی وشترسوارەکە تێگەیشتبوو: ڕەنگە ئەویش خەریکی فێربوونی ئەو زمانە گەردوونییە بووبێ، کە مامەڵە لەگەڵ ڕابردوو و داهاتووی خەڵکی دەکات. دایکی پێی دەگوتن، «ژیرەکان.» خەریکبوو کوڕەکە لەوە تێدەگەیشت، کە ژیری نوقوومبوونێکی لەناکاوی ڕۆحە لەناو تەرزمی ژیانی گەردووندا، ئەو شوێنەی چیرۆکی هەموو خەڵکی پێکەوە گرێ دراوە و دەتوانین هەموو شتێ بزانین، چونکە هەمووی لەوێدا نووسراوە.

کوڕەکە بیری کریستاڵفرۆشەکەی هاتەوە و گوتی، «مەکتوب.»

زۆرینەی بیابانەکە لمبوو و شوێنەکانی تریشی بەبەرد داپۆشرابوو. کاتێ کاروانەکە گاشەبەردێک ڕێی پێدەگرت، دەبوو بەدەوریدا بسووڕێتەوە؛ ئەگەر شوێنێکی گەورەی بەردەڵان هەبایە، دەبوو بەشێوەیەکی کاتی ڕێگەکەیان بگۆڕن. ئەگەر لەشوێنێ لمەکە بۆ سمی ئاژەڵەکان زۆر ورد و نەرم بایە، بۆ شوێنێکی باشتر دەگەڕان. لەهەندێک شوێندا، زەوییەکە بەخوێی دەریاچە وشکبووەکان داپۆشرابوو. لەو شوێنانەدا ئاژەڵەکان دەچەقین، وشترسوارەکانیش ناچاربوون بارەکانین لێبکەنەوە. لەو شوێنە خراپانەدا وشترسوارەکان خۆیان بارەکانیان هەڵدەگرت و دواتر لەوشترەکانیان باردەکردنەوە. ئەگەر ڕابەرێک بمردبا یا نەخۆش بکەوتبا، وشترسوارەکان دانەیەکی نوێیان هەڵدەبژارد.

بەڵام تەواوی ئەم شتانە لەبەر یەک هۆکاری بنچینەیی ڕوویان دەدا: گرنگ نەبوو چەندە گۆڕانکاری ڕوویدەدا و چەندێک ڕێگەیان دەگۆڕی، کاروانەکە بەهەمان ئاڕاستەی قیبلەنمادا دەڕۆیشت. هەرکات لەتەنگوچەڵەمەیەک نەجاتیان دەبوو و شتەکان وەک خۆیانیان لێدەهاتەوە، تەماشای ئەستێرەیەکیان دەکرد، کە شوێنی مێرگەکەی پێنیشان دەدان. کاتێ خەڵکی لەئاسمانی بەرەبەیاندا







ئەو ئەستێرەیەیان دەبینی، دەیانزانی لەڕێگەیەکی ڕاستدان بەرەو گەیشتن بەئاو، دارخورما، پەناگە و خەڵکی دیکە. تەنیا پیاوە ئینگلیزەکە لەتەواوی ئەم شتانە بێئاگا بوو؛ لەزۆرینەی کاتەکاندا، نوقوومی خوێندنەوەی کتێبەکانی بوو.

کوڕەکەش کتێبەکەی خۆی پێبوو و لەچەند ڕۆژی یەکەمی گەشتەکەدا هەوڵی خوێندنەوەی دەدا. بەڵام بۆیدەرکەوت تێبینیکردنی کاروانەکە و گوێگرتن بۆ دەنگی بایەکە زۆر بایەخدارترە. هەر کە وشترەکەی باشتر ناسی و پەیوەندی لەگەڵیدا دروستکرد، کتێبەکەی وەلانا. ئەفسانەیەکیشی بۆ خۆی دروستکردبوو، کە گوایا هەرکات کتێبەکەی دادەخست، شتێکی گرنگ فێردەبوو، پێی وابوو کتێبەکە بارێکی ناپێویست بێ.

لەگەڵ ئەو وشترسوارە بووبوو بەهاوڕێ، کە بەتەنیشتییەوە سواریی دەکرد. کاتێ شەوان بەدەوری ئاگرەکەدا دادەنیشتن، کوڕەکە سەرکەشییەکانی کاتی شوانی خۆی بۆ وشترسوارەکە دەگێڕایەوە.

لە یەکێک لەگفتوگۆکاندا، وشترسوارەکە باسی ژیانی خۆی کرد.

گوتی، «لە نزیکی ئەلقەیروم دەژیام. ڕەز و باغ و منداڵم هەبوو، ژیانێکم هەبوو و هەتا مردن نەدەگۆڕا. ساڵێک، کە دانەوێڵە زۆر باش بوو، هەمووومان چووین بۆ مەککە و دواییین فەرزی ژیانمان بەجێ هێنا. دەمتوانی بەدڵخۆشی بمرم و ئەوەیش هەستەکانمی باشتردەکرد.

«ڕۆژێک زەوی کەوتە لەرزە و ڕووباری نیلیش بەسەر کەنارەکانیدا ڕژا. ئەوە شتێکبوو و پێم وابوو بەسەر کەسانی دیکەدا بێ، بەڵام هەرگیز بەسەر مندا نەیەت. دراوسێکانم دەترسان لەگێژاوەکەدا دار زەیتوونەکانیان لەدەست بدەن و ژنەکەشم لەوە دەترسا منداڵەکانمان لەدەست بدەین. پێم وابوو هەموو ئەوەی هەمە وێران دەبێ.






«زەوییەکە وێرانبوو و دەبوو منیش ڕێگەیەک بۆ گوزەرانم بدۆزمەوە. ئێستاش وشترسوارم. بەڵام ئەو کارەساتە فێریکردم لەوشەی ئەڵلا تێبگەم: پێویست ناکا خەڵکی لەشتە نەزانڕاوەکان بترسن، ئەگەر بتوانن ئەوە بەدەست بهێنن، کە پێویستیانە و گەرەکیانە.

«ئێمە دەترسین ئەوەی هەمانە لەدەستی بدەین، ئیتر ئەگەر ئەو شتە ژیانمان بێ یا ماڵ و سامانمان. بەڵام ئەم ترسە نامێنێ کاتێ تێدەگەین چیرۆکی ژیانمان و مێژووی جیهان هەر بەهەمان دەست نووسراون.»

هەندێکجار کاروانەکەیان ڕووبەڕووی کاروانێکی دیکە دەبووەوە. هەمیشە کەسێک شتێکی پێبوو، کە کەسێکی دیکە پێویستی پێی بێ – هەر وەک بڵێی هەر بەڕاستی هەموو شتەکان بەهەمان دەست نووسراون. کاتێ بەدەوری ئاگرەکەدا دادەنیشتن، وشترسوارەکە زانیاری لەسەر گەردەلوول دەگۆڕییەوە و چیرۆکی لەسەر بیابانەکە دەگێڕایەوە.

لە ساتی دیکەدا، پیاوانی کڵاو لەسەر و نهێنی دەردەکەوتن؛ ئەوان عەرەبی کۆچەری بوون، کە چاودێری ڕێگەی کاروانەکەیان دەکرد. زانیارییان لەسەر دز و هۆزی چەتە پێدەدان. بەبێدەنگی دەهاتن و بەهەمان شێوە دەڕۆیشتن، پۆشاکی ڕەشیان لەبەردابوو و تەنیا چاوەکانیان بەدەرەوەبوو. شەوێکیان وشترسوارەکە هات بۆلای ئەو ئاگرەی پیاوە ئینگلیزەکە و کوڕەکەی لێدانیشتبوون. پێی گوتن، «دەنگۆی جەنگی هۆزەکان لەئارادایە.»

هەرسێکیان بێدەنگ بوون. کوڕەکە تێبینیکرد ترس باڵی بەسەر کەشەکەدا کێشاوە، گەرچی کەسیش قسەی نەدەکرد. جارێکی دیکە ئەزموونی زمانە بێ وشەکەی کردەوە ... زمانە جیهانییەکە.

پیاوە ئینگلیزەکە پرسی گەر تووشی مەترسی هاتبن.

وشترسوارەکە گوتی، «کاتێ پێدەخەیتە بیابان، ئیدی گەڕانەوە نییە. کاتێکیش ناتوانی بگەڕێیتەوە، پێویستە تەنیا نیگەرانی ڕێگەیەکی باش بی، کە بەرەو پێشت بەرێ. باقییەکەشی بەدەست ئەڵلایە، تەنانەت مەترسییش.»

بەگوتنی وشە سەیرەکە کۆتایی پێهێنا: «مەکتوب.»

پاش ئەوەی وشترسوارەکە ڕۆیشت، کوڕەکە بەپیاوە ئینگلیزەکەی گوت، «دەبێ زیاتر تێبینی کاروانەکە بکەی. زۆر جاران لادەدەین، بەڵام بەرەو هەمان خاڵی مەبەست دەڕۆین.»

پیاوە ئینگلیزەکە لەوەڵامدا گوتی، «دەبێ تۆش زیاتر لەبارەی جیهانەوە بخوێنیتەوە. لەو ڕوانگەیەوە، کتێب وەک کاروانە.»

ئەو کۆمەڵە گەورەیەی لەخەڵک و ئاژەڵ پێکهاتبوو، خێراتر دەڕۆیشتن. هەمیشە ڕۆژەکان بەبێدەنگی بەرێ دەکران، بەڵام ئێستا شەوەکانیش بەهەمان شێوەبوو — ئەو کاتانەی گەشتیارەکان ڕاهاتبوون بەدەوری ئاگرەکەدا قسە بکەن — بێدەنگ بوون. ئەوجا ڕۆژێک ڕابەری کاروانەکە بڕیاری دا، کە ئیدی ئاگرەکان دانەگیرسێندرێن، تا بەو شێوەیەش سەرنجی خەڵکی بەلای کاروانەکەدا ڕانەکێشن.

گەشتیارەکان خۆیان لەسەر ئەوە ڕاهێنا، کە ئاژەڵەکان بەشێوەیەکی بازنەیی خڕبکەنەوە و پێکەوە لەناوەڕاستیاندا بخەون، تا بەو شێوەیەش خۆیان لەسەرماکە بپارێزن. ڕابەرەکەش پاسەوانی چەکداری بەدەوری کۆمەڵەکەدا بڵاوکردەوە.

شەوێکیان پیاوە ئینگلیزەکە نەیتوانی بخەوێ. کوڕەکەی بانگکرد و پیاسەیەکیان بەناو گردەباکانی دەوری شوێنی حەوانەوەکەیاندا کرد. هەیڤ پڕبوو و کوڕەکەش چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ پیاوە ئینگلیزەکە گێڕایەوە.






ئـەو بەشـەی چیرۆکەکـە دڵـی پیـاوە ئینگلیزەکـەی بردبـوو، کـە توانیبـووی لەپـاش کارکـردن لەدوکانـی کریسـتاڵەکەدا، بـەو شـێوە بەرچـاوە پێـش بکەوێـت.

گوتـی، «ئـەوە ئـەو ڕێسایەیە، کـە هەمـوو شتەکان بەڕێـوە دەبات. لەکیمیـادا پێـی دەگوتـرێ ڕۆحـی جیهـان. کاتـێ بەتەواوەتـی ئارەزووی شـتێک دەکـەی، ئـەو کاتـە بەتەواوەتـی لەڕۆحـی جیهان نزیک دەبیتەوە. هەمیشـە هێزێکـی ئەرێنییە.»

گوتیشـی کـە ئـەوە تەنیـا دیارییـەک نییـە بـۆ مـرۆڤ، کـە هەمـوو شـتێ لـەڕووکاری زەوییـدا ڕۆحێکـی هەیـە، ئیتـر ئەگـەر کانـزا، ڕووەک یـا ئـاژەڵ بـێ — یـان گـەر تەنانـەت بیرۆکەیەکـی سـادەش بـێ.

«هەمـوو شـتێ لەسـەر زەوی بەبەردەوامـی دەگـۆڕێ، چونکـە زەوی زینـدووە ... ڕۆحیشـی هەیـە. ئێمـە بەشـێکین لەو ڕۆحـە و بەزەحمەتیش بۆمـان دەردەکـەوێ کار بـۆ ئێمـە دەکات. بـەڵام بەدڵنیاییـەوە لەدوکانـی کریسـتاڵەکەدا تێبینـی ئـەوەت کـردووە، کـە تەنانـەت شووشـەکانیش هـاوکاری سـەرکەوتنەکەی تۆیـان دەکـرد.»

کاتـێ کوڕەکـە تەماشـای هەیـڤ و لمـە ڕووناکەکـەی دەکـرد، بـۆ ماوەیـەک بیـری لـەوە کـردەوە. گوتـی، «لـە کاتـی بڕینـی بیابانەکـەدا، تەماشـای کاروانەکـەم کـردووە. کاروانەکـە و بیابانەکـە بەهەمـان زمـان دەدوێـن، هـەر بۆیـە بیابانەکـە ڕێگـەدەدات پێیـدا بپەڕێتـەوە. تێبینـی دەکـەم بزانـم هـەر هەنگاوێکـی کاروانەکـە لەکاتـی خۆیدایـە، گـەر لەکاتی خۆیشـیدا بـوو، کەواتـە دەگەینـە مێرگەکـە.»

«ئەگـەر هـەر کەسـێک لەئێمـە تەنیـا بەپشـت بەسـتن بەئازایەتـی بهاتبایەتـە نـاو ئـەم کاروانـە و لێـی تێنەگەیشـتبایە، گەشـتەکە زۆر زەحمەتتـر دەبـوو.»

لەوێدا وەستابوون و تەماشای هەیڤەکەیان دەکرد.

کوڕەکە گوتی، «ئەوە جادووی پێشهاتەکانە. تێبینیمکردووە چۆن ڕابەرەکان هێماکانی بیابانەکە دەخوێننەوە و چۆن ڕۆحی کاروانەکە لەگەڵ ڕۆحی بیابانەکە دەدوێت.»

پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «واباشترە زیاتر تێبینی کاروانەکە بکەم.»

کوڕەکە گوتی، «بۆ منیش واباشترە کتێبەکانی تۆ بخوێنمەوە.»



ئەو کتێبانە سەیربوون. باسی جیوە، خوێ، ئەژدیها و پاشایان دەکرد و لەیەک شتیشیان تێنەدەگەیشت. بەڵام وادەردەکەوت فیکرەیەک خۆی لەهەموو کتێبەکاندا دووبارە بکاتەوە: هەموو شتەکان دەرکەوتەی تاکە شتێکن.

لە یەکێک لەکتێبەکاندا فێری ئەوەبوو، کە گرنگترین نووسراوی کیمیا تەنیا چەند دێڕێکە و لەسەر ڕووکاری زمروتێک هەڵکەندراوە.

پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «ئەوە پێی دەگوترێ تابلۆی زمروت،» شانازیدەکرد شتێ فێری کوڕەکە بکات.

کوڕەکە پرسی، «ئەی کەواتە ئەم هەموو کتێبەمان بۆچییە؟»

پیاوە ئینگلیزەکە لەوەڵامدا گوتی، «بۆ ئەوەی لەو چەند دێڕە تێبگەین،» وا دەردەکەوت بڕوای بەوە هەبێ، کە خۆی گوتبووی.

ئەو کتێبەی زۆر سەرنجی کوڕەکەی ڕاکێشا، ئەوەبوو کە چیرۆکی کیمیاگەرە بەناوبانگەکانی دەگێڕایەوە. ئەوان کەسانێک بوون، کە تەواوی ژیانی خۆیان لەتاقیگەکانیاندا بۆ پوختەکردنی کانزاکان تەرخانکردبوو؛ باوەڕیان وابوو ئەگەر کانزایەکە بۆ ماوەی چەندین ساڵ گەرم بکرێ، خۆی لەهەموو توخمەکان ئازاددەکات و ئەوەش







کە دەمێنێتەوە، ڕۆحی جیهان دەبێ. ئەم ڕۆحی جیهانە ڕێگەیان پێدەدات لەهەموو شتێکی سەر ڕووکاری زەوی تێبگەن، چونکە ئەوە زمانێکبوو و هەموو شتەکان پێی دەدوان. ئەوان بەو دۆزینەوەیەیان دەگوت کاری ناوازە — شتێکی نیمچەشل و نیمچەڕەق بوو.

کوڕەکە پرسی، «ناتوانی تەنیا تێبینی مرۆڤەکان و پێشهاتەکان بکەی بۆ ئەوەی لەو زمانە تێبگەی؟»

پیاوە ئینگلیزەکە بەجاڕسی گوتی، «تۆ شێتییەکت بۆ سادەکردنەوەی هەموو شتەکان هەیە. کیمیا ڕژێمێکی جیدییە. دەبێ هەموو شتەکان بەو شێوەیە بڕۆن، کە مامۆستاکان پێیدا تێپەڕیوون.»

کوڕەکە بۆیدەرکەوت بەبەشە نەرمەکەی کاری ناوازە دەگوترێ نەمری ژیان و هەموو نەخۆشییەک چاکدەکاتەوە؛ ڕێگەی پیربوونیش لەکیمیاگەرەکان دەگرێ. بەشە ڕەقەکەش پێی دەگوترێ بەردی فەیلەسوف.

پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «دۆزینەوەی بەردی فەیلەسوف ئاسان نییە. کیمیاگەرەکان چەندین ساڵیان لەتاقیگەکانیاندا بەسەربردووە و تێبینی ئەو ئاگرەیان کردووە، کە کانزاکانی خاوێنکردووەتەوە. هێندە کاتیان بەتەنیشت ئاگرەکەوە بەسەربردووە، کە وردە وردە کۆڵیان لەفیزی جیهان داوە. بۆیان دەرکەوتووە پاکژکردنەوەی کانزاکان دەبێتە هۆی پاکژکردنەوەی خۆیشیان.»

کوڕەکە بیری لەکریستاڵفرۆشەکە کردەوە. گوتبووی، کە پاککردنەوەی کریستاڵەکان شتێکی باشبووە بۆ کوڕەکە، تا بەو شێوەیەش بتوانێ خۆی لەبیرۆکەی نەرێنی ئازاد بکات. کوڕەکە زیاتر و زیاتر باوەڕی بەوە دەکرد، کە دەکرێ کیمیا لەژیانی ڕۆژانەدا فێرببی.

پیاوە ئینگلیزەکە گوتی، «هەروەها بەردی فەیلەسوف تایبەتمەندییەکی دڵڕفێنی هەیە. تەلەزمێکی بچووک لەبەردەکە دەتوانێ کانزایەکی گەورە بگۆڕێ بەئاڵتوون.»

بە بیستنی ئەوە، کوڕەکە زیاتر سەرنجی بەلای کیمیادا ڕۆیشت. پێی وابوو ئەگەر کەمێک ئارام بگرێ، دەتوانێ هەموو شتێ بگۆڕێ بەئاڵتوون. ژیانی ئەو خەڵکانەی خوێندەوە، کە توانیبوویان لەوەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنن: ئیلڤسیوش، ئیلیەس، فومکەنەلی و گیڤێر. ئەو چیرۆکانە دلڕفێن بوون: هەموویان تا کۆتایی دوای چارەنووسی خۆیان کەوتبوون. گەشتیانکردبوو، لەگەڵ مرۆڤی ژیردا دوابوون، پەرجوویان بۆ کەسانی بەگومان ئافراندبوو و بەردی فەیلەسوف و نەمری ژیانیان دۆزیبووەوە.

بەلام کاتێ کوڕەکە ویستی بزانێ چۆن کاری ناوازە بەدەست دەهێندرێ، بەتەواوەتی لەبابەتەکەدا ون بوو. هەمووی وێنەی کۆد و نووسراوی نهێنی بوون.



شەوێک لەپیاوە ئینگلیزەکەی پرسی، «بۆچی ئەوان هێندە شتەکان ئاڵۆز دەکەن؟» کوڕەکە تێبینیکرد پیاوە ئینگلیزەکە بێزارە و بیری کتێبەکانی دەکات.

گوتی، «ئەو کەسانەی بەرپرسیارێتی تێگەیشتنیان هەیە، دەبێ تێبگەن. وێنای بکە هەموو کەسێ بیتوانیبا قورقوشم بکات بەئاڵتوون. ئەوکاتە ئاڵتوون بەهای خۆی لەدەست دەدا.

«تەنیا ئەو کەسانەی بەردەوامن و بەقووڵی لەبوارەکەدا دەخوێنن، دەتوانن کاری ناوازە بەدەست بهێنن. هەر لەبەر ئەو هۆکارەش من

لێرە، لەناوەڕاستی بیابانەکەدام. بەدووی کیمیاگەرێکی ڕاستەقینەدا دەگەڕێم، تا لەلێکدانەوەی هێماکاندا یارمەتیم بدات.»
کوڕەکە پرسی، «ئەو کتێبانە کەی نووسراون؟»
«چەندین سەدە بەر لەئێستا.»
کوڕەکە بەردەوامبوو، «لەم ڕۆژگارەدا تیراژیان نەماوە. هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ ئەوەی هەموو کەسێ بتوانێ فێری کیمیا ببێ. بۆچی ئەم زمانە سەیرە پڕ لەوێنەیەیان بەکارهێناوە؟»
پیاوە ئینگلیزەکە ڕاستەوخۆ وەڵامی نەدایەوە. گوتی لەو چەند ڕۆژەی دواییدا خەریکی تێبینیکردنی گەشتی کاروانەکە بووە، بەڵام هیچ شتێکی نوێ فێرنەبووە. تاکە شتێک کە تێبینیکردووە، ئەوەیە قسەکردن لەبارەی جەنگەوە زیاتر و زیاتر دووبارە بووەتەوە.



ئەوجا ڕۆژێک کوڕەکە کتێبەکانی بۆ پیاوە ئینگلیزەکە گەڕاندەوە.
پیاوە ئینگلیزەکە پرسی، «ئایا هیچ شتێ فێربووی؟» پەرۆشبوو بزانێ چی دەبیستێ. پێویستی بەکەسێک بوو قسەی لەگەڵ بکات، تا خۆی لەبیرکردنەوە لەئەگەرەکانی جەنگ بەدوور بگرێ.
«فێربووم جیهان ڕۆحێکی هەیە، هەر کەسێکیش لەو ڕۆحە تێبگا، دەتوانێ لەزمانی شتەکان تێبگات. فێربووم چەندین کیمیاگەر چارەنووسی خۆیان دەستنیشانکردووە، بەو شێوەیەش ڕۆحی جیهان، بەردی فەیلەسوف و نەمری ژیانیان دۆزیوەتەوە.
«بەڵام لەسەروو هەموو ئەوانەشەوە فێربووم، کە ئەم شتانە هێندە سادەن، دەکرێ لەسەر ڕووکاری زمروتێک جێگەیان ببێتەوە.»
پیاوە ئینگلیزەکە بێهیوابوو. ساڵانی توێژینەوە، هێما جادووییەکان،

وشـە سـەیرەکان و کەلوپەلـی تاقیگـە ... هیچ کام لەمانـە سـەرنجی کوڕەکەیـان ڕانەکێشـابوو. لەبیـری خۆیـدا گوتـی، ئەڵبەتـە ڕۆحی زۆر سـەرەتاییە بۆ تێگەیشـتن لـەو شـتانە.
کتێبەکانی بردەوە و کردنیەوە ناو جانتاکەی.
گوتـی، «دەسـت بکـەرەوە بەتەماشـاکردنی کاروانەکـە. هیچی فێری من نەکـرد.»
کوڕەکـە دەسـتیکردەوە بەتێبینیکردنـی بیابانەکـە و ئـەو لمـەی ئاژەڵـەکان دەبوونـە هـۆی بەرزکردنـەوەی. بەخـۆی گـوت، «هەمـوو کەسێ ڕێگەیەکـی تایبەتـی بـۆ فێربوونـی شـتەکان هەیـە. ڕێگـەی ئـەو لەهـی مـن ناچـێ و هـی منیـش لـەوەی ئـەو ناچـێ. بـەڵام هەردووکمان بـەدووی چارەنووسـی خۆمانـدا دەگەڕێیـن، ڕێـزی ئـەوەش دەگـرم.»



کاروانەکـە بەشـەو و ڕۆژ گەشـتیدەکرد. عەرەبـە کۆچەرییـە دەموچاو داپۆشـراوەکان زیاتـر و زیاتـر دەردەکەوتـن، وشترسـوارەکەش – ئـەوەی بووبـووە هاوڕێیەکـی باشـی کوڕەکـە – ڕوونیکـردەوە، کـە جەنگی نێوان هـۆزەکان دەسـتی پێکـردووە. دەبـێ کاروانەکـە بەختێکـی باشـی هەبێ بـۆ ئـەوەی بگاتـە مێرگەکـە.
ئاژەڵـەکان مانـدوو بـوون و پیاوەکانیـش کەمتـر و کەمتـر لەناو خۆیانـدا قسـەیاندەکرد. بێدەنگییەکـە خراپتریـن شـتی شـەو بـوو، تەنیا ناڵـەی وشـترێک – کـە پێشـتر جگـە لەناڵـەی وشـترێک هیچی تر نەبـوو – ئێسـتا هەمووانـی دەترسـاند، چونکـە ڕەنگبـوو نیشـانەی هێرشـکردن بـێ.
وادیاربوو وشترسوارەکە زۆر گوێ بەجەنگەکە نەدات.







شەوێکی بێ هەیڤ و ئاگر، کاتێ خەریکی خواردنی هێشوویەک خورمابوو، گوتی، «من دەژیم. کاتێ دەخۆم، تەنیا بیر لەخواردن دەکەمەوە. ئەگەر بڕۆم، تەنیا خۆم بەڕۆیشتنەکەوە سەرقاڵ دەکەم. ئەگەر پێویست کا شەڕ بکەم، ئەوا ئەو ڕۆژەش وەک هەموو ڕۆژەکانی تر باشە بۆ مردن.

«چونکە نە لەڕابردوو و نە لەداهاتووشدا ناژیم. تەنیا بایەخ بەئێستا دەدەم. ئەگەر بتوانی تەنیا سەرقاڵی ئێستا بی، ئەوا دەبیتە کەسێکی شاد. بۆت دەردەکەوێ ژیان لەبیابانەکەدا هەیە، ئەستێرە بەئاسمانەوەیە و پیاوی هۆزەکان دەجەنگن، چونکە ئەوانیش بەشێکن لەمرۆڤایەتی. ژیانت بۆ دەبێتە ئاهەنگ، دەبێتە فێستیڤاڵێکی گەورە، چونکە ژیان ڕێک لەم ساتەدا بوونی هەیە.»

دوو شەو دواتر، کاتێ دەیویست بخەوێ، کوڕەکە بۆ ئەو ئەستێرەیە دەگەڕا، کە هەموو شەوێ بەدووی دەکەوتن. هەستیدەکرد ئاسۆ کەمێک نزیکترە، چونکە وادەردەکەوت ئەستێرەکان لەناو بیابانەکەدا ببینێ.

وشترسوارەکە گوتی، «ئەوە مێرگەکەیە.»

کوڕەکە پرسی، «ئەی بۆچی هەر ئێستا نەڕۆین بۆ ئەوێ؟»

«چونکە پێویستمان بەخەوە.»



کوڕەکە لەگەڵ خۆرهەڵاتندا بەئاگا هات. لەبەردەمیدا، ئەو شوێنەی شەوی پێشوو ئەستێرە بچووکەکانی لێبوو، ئێستا پڕبوو لەڕیزە دارخورمایەکی بێکۆتا، کە بەتەواوی بیابانەکەدا درێژبووبوونەوە.

پیاوە ئینگلیزەکە، کە ئەویش زوو بەئاگا هاتبوو، گوتی،







«ڕزگارمانبوو!»

کوڕەکە بێدەنگ بوو. بەبێدەنگی بیابانەکە ئاسوودەبوو و تەنیا بەتەماشاکردنی دارەکان قایلبوو. ڕێگەیەکی درێژی لەبەردەمدا مابوو بۆ گەیشتن بەهەرەمەکان، ڕۆژێکیش دادەهات، کە ئەم بیابانە تەنیا دەبووە یادەوەری. بەڵام ئەمە ساتی ئێستابوو — ئەو ئاهەنگەی وشترسوارەکە باسیکردبوو — و دەیویست تێیدا بژی، هەر وەک چۆن وانەی لەڕابردوو وەردەگرت و خەونی بەداهاتووەوە دەبینی. ڕۆژێکیش دیمەنی دارخورماکان دەبوونە یادگاری، لەئێستادا سێبەر، ئاو و پەناگەی جەنگ بوو. دوێنێ ناڵەی وشترێک ئامارەی مەترسی بوو، ئەمڕۆ ڕیزە دارخورمایەک دەیتوانی پەرجوویەک بئافرێنێ.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، جیهان بەچەندین زمان دەدوێ.



کاتێ کیمیاگەرەکە ئەو سەدان خەڵک و ئاژەڵەی بینی دەگەنە مێرگەکە، لەبیری خۆیدا گوتی، کات خێرا تێدەپەڕێ، کاروانەکانیش بەهەمان شێوەن. خەڵکی ئەوێ هاواریان بەڕووی تازە گەیشتووەکاندا دەکرد، تەپوتۆز خۆری بیابانەکەی تاریککردبوو، منداڵەکانیش بەبینینی میوانە بێگانەکان چالاک بوون. کیمیاگەرەکە بینی سەرۆک هۆزەکان سڵاو لەڕابەری کاروانەکە دەکەن و گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەن.

بەڵام هیچ کام لەوانە بەلای کیمیاگەرەکەوە گرنگ نەبوون. پێشتر چەندین خەڵکی بینیووە، کە هاتوون و ڕۆیشتوون، بیابانەکەش هەر وەک خۆی ماوەتەوە. هەمیشە گردەباکان بەبایەکە دەگۆڕان، بەڵام هێشتا هەر ئەو لمەبوو، کە لەمنداڵییەوە پێی ئاشنابوو. هەمیشە







کەیفی بەو شادییە دەهات، کە گەشتیارەکان ئەزموونیاندەکرد، کاتێ لەپاش چەند هەفتەیەک لەلمی زەرد و ئاسمانی شین، بۆ یەکەمجار سەوزایی دارخورماکانیان دەبینی. لەبیری خۆیدا گوتی، ڕەنگە خودا بیابانەکەی بۆ ئەوە دروستکردبێ، کە مرۆڤ دارخورماکان بنرخێنێ.

بڕیاریدا خۆی بەبابەتی کرداریترەوە سەرقاڵ بکات. دەیزانی کەسێک لەکاروانەکەدا هەیە و ئەم کەمێک لەنهێنییەکانی خۆی فێردەکات. پێشهاتەکان ئەوەیان پێگوتبوو. هێشتا ئەو کەسەی نەدەناسی، بەڵام لەگەڵ دەرکەوتنیدا، چاوە شارەزاکانی دەیناسینەوە. هیواداربوو وەک فێرخوازەکەی پێشووی بەتوانا بێ.

لەبیری خۆیدا گوتی، نازانم بۆچی دەبێ ئەم شتانە بەوشەی زارەکی بگوێزرێنەوە. مەسەلەکە ئەوە نییە ئەوانە نهێنی بن؛ خودا بەئاسانی نهێنییەکانی بۆ هەموو ئافەریدەکانی ئاشکرا دەکات.

تەنیا یەک ڕوونکردنەوەی بۆ ئەم ڕاستییە هەبوو: دەبێ شتەکان بەم شێوەیە بگوێزرێنەوە، چونکە لەژیانێکی خاوێن دروست بوون، ئەم جۆرە ژیانەش بەوێنە و وتە باسی لێوە ناکرێ.

لەبەر ئەوەی خەڵکی بایەخیان بەوێنە و وشە داوە، وردە وردە زمانی جیهانیان لەیادکردووە.



کوڕەکە بڕوای بەچاوەکانی خۆی نەدەکرد: مێرگەکە، لەجێی ئەوەی تەنیا بیرێکی ئاو بێ و چەند دارخورمایەک دەوریان دابێ — هەر وەک چۆن پێشتر لەکتێبێکی جوگرافیادا بینیبووی — لەچەندین شار و شارۆچکەی ئیسپانیا گەورەتر بوو. سێسەد بیر و پەنجاهەزار دارخورما و بێشومار چادری لێبوو، کە بەناو دارخورماکاندا







بڵاوکرابوونەوە.

پیاوە ئینگلیزەکە، کە ئارامی لێبڕابوو بۆ ئەوەی چاوی بەکیمیاگەرەکە بکەوێ، گوتی، «هەر دەڵێی هەزار و یەک شەوەیە.»

چواردەوریان بەمنداڵ گیرابوو، حەزیاندەکرد ئەو ئاژەڵ و خەڵکە ببینن، کە دەگەیشتنە ئەوێ. پیاوانی مێرگەکە دەیانویست بزانن گەر لەڕێگە هیچ جەنگێکیان بەدیکردبێ، ژنەکانیش پێشبڕکێیانبوو تا فریای ئەو جل و بەردە بەنرخانە بکەون، کە بازرگانەکان هێنابوویان. بێدەنگی بیابانەکە خەونێکی دووربوو؛ گەشتیارەکانی ناو کاروانەکە هەر قسەیاندەکرد، پێدەکەنین و هاواریاندەکرد، هەر وەک بڵێی لەجیهانی ڕۆحەکان دەرهێندراون و جارێکی تر فڕێدراونە جیهانی مرۆڤەوە. دڵخۆش و ئاسوودە بوون.

لە بیابانەکەدا زۆر وریای خۆیان بوون، بەڵام وشترسوارەکە بۆ کوڕەکەی ڕوونکردەوە، کە هەمیشە مێرگەکان هەرێمی بێلایەنن، چونکە ژن و منداڵ زۆرینەی دانیشتوانەکانیان پێکدەهێنن. کۆمەڵێک مێرگ لەبیابانەکەدا هەن، بەڵام هۆزنشینەکان لەبیابانەکەدا دەجەنگن و مێرگەکان وەک پەناگە بەجێ دەهێڵن.

ڕابەرەکە بەزەحمەت توانی هەموو گەشتیارانی کاروانەکە کۆبکاتەوە و فەرمانیان پێبدا. دەبوو ئەو کۆمەڵە لەمێرگەکە بمێننەوە، تا ململانێی نێوان هۆزەکان کۆتایی پێدەهات. لەبەر ئەوەی ئەوان میوان بوون، دەبوو لەگەڵ خەڵکی مێرگەکەدا بژین، باشترین جێگەشیان بۆ دابین دەکرا. ئەوە یاسای میوانداری بوو. ئەوجا داوایکرد هەمووان، بەحەسحەسەکانی خۆیشیەوە، چەکەکانیان بدەن بەو پیاوانەی سەرۆک هۆزەکان دیارییان کردبوون.

ڕابەرەکە وەک ڕوونکردنەوە گوتی، «ئەوانە یاسای جەنگن. مێرگەکان پەنای هێزی سەربازی نادەن.»

بۆ سەرسوڕهێنانی کوڕەکە، پیاوە ئینگلیزەکە دەمانچەیەکی خلۆکەی کرۆمی لەجانتاکەی دەرهێنا و دای بەو پیاوانەی چەکەکانیان کۆدەکردەوە.

پرسی، «دەمانچەت بۆچییە؟»

پیاوە ئینگلیزەکە لەوەڵامدا گوتی، «یارمەتی داوم بڕوا بەخەڵکی بکەم.»

لەهەمان کاتدا، کوڕەکە بیری لەسامانەکەی دەکردەوە. چەندێک لەبەدیهێنانی خەونەکەی نزیک دەبووەوە، هێند شتەکان زەحمەتتر دەبوون. وادیاربوو ئەوەی پاشا پیرەکە بە»بەختی دەستپێکەر» ناوی هێنابوو، ئیدی کاری خۆی نەکات. کاتێ بەدووی خەونەکەی کەوتبوو، بەبەردەوامی کۆڵنەدەری و ئازایەتی تاقیکرابووەوە. نەدەبوو پەلەبکا و نەشدەبوو نائارام بێ. ئەگەر شێتانە بەرەو پێش بڕۆشتبا، ئەوا ئەو هێما و پێشهاتانەی نەدەبینی، کە خودا لەسەر ڕێگەکەی داینابوون.

خودا لەڕاڕەوەکەمدا جێگیریکردوون. بەو بیرۆکەیە سەری خۆی سوڕماند. هەتا ئەو کاتەی پێی وابوو پێشهاتەکان شتگەلێکی ناو ئەم جیهانە بن. وەک خواردن و خەوتن، یان وەک خۆشەویستی و کار دۆزینەوە. هەرگیز وەک کۆمەڵێک تێرمی زمانێک حیسابی بۆ نەکردوون، کە خودا بەکاری بهێنێ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی دەبێ چی بکا.

دیسان بەخۆی گوت، «نائارام مەبە. بەو شێوەیەیە کە وشترسوارەکە گوتی: کاتی نانخواردن تەنیا نانبخۆ. کاتێکیش کاتی بەرەوپێش چوون بوو، تەنیا بەرەو پێش بڕۆ.»

یەکەم ڕۆژ، هەموویان لەشەکەتیدا خەوتن، بەپیاوە ئینگلیزەکەشەوە. کوڕەکە شوێنێکی بۆ دیاری کرا، کە لەهاوڕێکەیەوە







دووربوو، لەچادرێک و لەگەڵ پێنج لاوی هاوتەمەنی خۆیدا بوو. ئەوان بیاباننشین بوون و حەزیاندەکرد چیرۆکی شارە گەورەکان ببیستن.

کوڕەکە باسی ژیانی شوانی خۆی بۆ کردن و خەریکبوو باسی ئەزموونی دوکانی کریستاڵەکەشیان بۆ بکا، بەلام لەو کاتەدا پیاوە ئینگلیزەکە هاتە ناو چادرەکەوە.

کاتێ کوڕەکەی دەبردە دەرەوە، گوتی، «تەواوی ئەم بەیانییە بۆ تۆ گەڕاوم. پێویستم پێتە لەدۆزینەوەی شوێنی ژیانی کیمیاگەرەکەدا یارمەتیم بدەیت.»

یەکەمجار هەوڵیاندا خۆیان بیدۆزنەوە. بێگومان کیمیاگەرێک جیاواز لەباقی خەڵکی مێرگەکە دەژی، واش دیاربوو هەمیشە فرنێک لەچادرەکەیدا ئیش بکات. هەموو شوێنێک گەڕان و بۆیان دەرکەوت مێرگەکە زۆر لەوە گەورەترە، کە ئەوان وێنایاندەکرد؛ سەدان چادری لێبوو.

لەنزیک یەکێک لەبیرەکان، پیاوە ئینگلیزەکە بەتەنیشت کوڕەکەوە دانیشت و گوتی، «نزیکەی تەواوی ڕۆژێکمان بەفیڕۆدا.»

کوڕەکە پێشنیاریکرد، «ڕەنگە واباشتربێ لەکەسێ بپرسین.»

پیاوە ئینگلیزەکە نەیدەویست خەڵکانی تر هۆکاری هاتنەکەی بزانن، نەشیدەتوانی مێشکی یەکلایی بکاتەوە. بەلام لەکۆتاییدا قایل بوو، کوڕەکە، کە عەرەبییەکەی لەو باشتربوو، پرسیار لەخەڵکی بکات. کوڕەکە لەژنێک نزیک بووەوە، کە هاتبوو لەبیرەکە کوندەیەک پڕبکات لەئاو.

«نیوەڕۆت باش، خاتوون. دەمەوێ بزانم کیمیاگەرەکە لەکوێی مێرگەکە دەژی.»

ژنەکە گوتی هەرگیز شتی وای نەبیستووە و بەخێرایی ڕۆیشت. بەلام بەر لەوەی هەڵبێ، ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد بەوەی واباشترە لەگەڵ

ژنە بەرگ ڕەشەکان قسە نەکا، چونکە ئەو ژنانە هاوسەرگیرییان کردووە. پێویستە ڕێزی نەریتەکان بگرێ.

پیاوە ئینگلیزەکە هیوابڕاو بوو. وادەردەکەوت گەشتەکەی بەخۆڕایی کردبێ. کوڕەکەش غەمباربوو؛ هاوڕێکەی بەدووی چارەنووسی خۆیەوە بوو. کاتێکیش کەسێ بەشوێن شتێکی لەو بابەتەوەیە، تەوای گەردوون ڕەنج بۆ یارمەتیدانی دەدات، تا سەربکەوێ — پاشا پیرەکە وای گوتبوو. ئەڵبەتە لەخۆوە نەیگوتبوو.

کوڕەکە گوتی، «پێشتر خۆیشم هیچم لەبارەی کیمیاگەرەوە نەبیستووە. ڕەنگە خەڵکی ئێرە هیچ لەو بارەوە نەزانن.»

چاوەکانی پیاوە ئینگلیزەکە ڕوونبوونەوە. «ڕاستە! ڕەنگە لێرە کەس نەزانێ کیمیاگەر چییە! بزانە لێرە کێ نەخۆشی خەڵکی چاک دەکاتەوە!»

چەند ژنێکی بەرگ ڕەش بۆ بردنی ئاو هاتنە سەر بیرەکە، بەڵام سەرەڕای پێداگری پیاوە ئینگلیزەکەش، کوڕەکە لەگەڵ هیچیان قسەی نەکرد. ئەوجا پیاوێک نزیک بووەوە.

کوڕەکە پرسی، «کەس دەناسی لێرە بتوانێ نەخۆشی خەڵکی چاک بکاتەوە؟»

بەڕوونی دیاربوو پیاوەکە لەبێگانەکە ترساوە، گوتی، «ئەڵڵا چارەسەری نەخۆشییەکانمان دەکات. تۆ بۆ پزیشکی جادووگەر دەگەڕێی.» چەند دێڕێکی لەقورئان گوت و ڕۆیشت.

پیاوێکی تر دەرکەوت. بەتەمەنتربوو و سەتڵێکی بچووکیشی هەڵگرتبوو. کوڕەکە هەمان پرسیاری دووبارەکردەوە.

کوڕەکە گوتی، «چونکە هاوڕێکەم ماوەی چەند مانگێک گەشتیکردووە تا چاوی بەو کەسە بکەوێ.»

لەپاش ساتێ بیرکردنەوە، پیرەپیاوەکە گوتی، «ئەگەر پیاوێکی







لـەو شـێوەیە لـەم مێرگـە هەبـێ، دەبـێ کەسـێکی زۆر بەهێـز بـێ. تەنانـەت سـەرۆک هۆزەکانیـش گـەر بیانـەوێ، ناتوانـن چاویـان پێـی بکـەوێ. مەگـەر خـۆی قایـل بـێ.

«چـاوەڕێ بکـە جەنگەکـە کۆتایـی بـێ. پاشـان لەگـەڵ کاروانەکـە بـڕۆ. هـەوڵ مـەدە خـۆت تێکەڵـی ژیانـی مێرگەکـە بکەیـت،» ئەمـەی گـوت و ڕۆیشـت.

بـەڵام پیـاوە ئینگلیزەکـە شـادمان بـوو. ئـەوان لەپێگەیەکـی ڕاسـتدا بـوون.

لەکۆتاییـدا کیژێکـی گەنـج نزیـک بـووەوە، کـە بەرگـی ڕەشـی لەبەردا نەبـوو. گۆزەیەکـی لەسـەر شـانبوو و لەچکەیەکـی دابـوو بەسـەریدا، بـەڵام دەموچـاوی دانەپۆشـرابوو. کوڕەکـە لێـی نزیـک بـووەوە تـا پرسـیاری کیمیاگەرەکـەی لێبـکات.

لـەو کاتـەدا، هـەر دەتگـوت کات وەسـتاوە و ڕۆحـی جیهـان شـاڵاوی بـۆ بـردووە. کاتـێ سـەیری چـاوە ڕەشـەکانی کـرد و بینـی لێوەکانـی لەنێـوان پێکەنیـن و بێدەنگیـدا قەتیـس مـاوە، گرنگتریـن بەشـی ئـەو زمانـە فێربـوو، کـە تـەواوی جیهـان قسـەی پێدەکـەن — ئـەو زمانـەی هەمـوو کەسـێکی سـەر زەوی دەتوانـێ بـەدڵ لێـی تێبـگات. ئـەوە عەشـق بـوو. شـتێک زۆر لەمرۆڤایەتـی کۆنتـر، زۆر لەبیابانەکـە دێرینتـر. شـتێک، کـە هەمـان هێـز هەوڵـی بـۆ دەدا، کاتـێ دوو جـووت چـاو پێـک دەگـەن، هـەر وەک ئـەوەی لای بیرەکـەوە ڕوویـدا. کچەکـە پێکەنـی، بەدڵنیاییشـەوە ئـەوە پێشـهاتبوو — ئـەو پێشـهاتەی لەتـەواوی ژیانیـدا چاوەڕێیدەکـرد، بەبـێ ئـەوەی بشـزانێ چاوەڕوانـی دەکات. ئـەو پێشـهاتەی هەوڵیـدەدا لەمـەڕەکان و کتێبەکانیـدا، لەکریسـتاڵەکان و بێدەنگـی بیابانەکـەدا بیدۆزێتـەوە.

ئـەوە زمانـی پاکـژی جیهـان بـوو. پێویسـتی بەڕوونکردنـەوە نییە،







هەر وەک ئەوەی چۆن گەردوونیش کاتێ گەشت بەکاتی ناکۆتادا دەکات، پێویستی بەهیچ ڕوونکردنەوەیەک نییە. ئەوەی کوڕەکە لەو ساتەدا هەستی پێکرد ئەوەبوو، کە ڕووبەڕووی تاکە ئافرەتی ژیانی بووەتەوە، بەبێ هیچ وشەیەک، کچەکەش هەستی بەهەمان شت دەکرد. لەهەموو شتێکی جیهان زیاتر لەوە دڵنیابوو. دایک و باوک و نەنک و باپیری پێیان گوتبوو، دەبێ بەر لەهاوسەرگیری، عاشق بێ. بەڵام ڕەنگە ئەو خەڵکەی بەو شێوەیە بیریانکردووەتەوە، هەرگیز فێری زمانە جیهانییەکە نەبووبن. چونکە کاتێ ئەو زوبانە دەزانی، تێدەگەیت کەسێک لەجیهاندا چاوەڕێت دەکات، ئیتر گەر لەناوەڕاستی بیابانەکەدا یا لەشارێکی گەورەدا بێ. کاتێکیش دوو کەسی لەو چەشنە یەک دەبینن و چاوەکانیان پێک دەگەن، ڕابردوو و داهاتوو هیچ گرنگییەکیان نامێنێ. تەنیا ئەو ساتە و ئەو دڵنیاییە بوونی دەبێ، کە هەمان شتەکانی ژێر خۆر بەهەمان دەست نووسراون. ئەو دەستەیە، کە خۆشەویستی دەورووژێنێ و ڕۆحێکی تر بۆ هەموو کەسێکی جیهان دەئافرێنێ. بەبێ خۆشەویستییەکی لەو جۆرە، خەونی مرۆڤ بێواتایە.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، مەکتوب.

پیاوە ئینگلیزەکە کوڕەکەی ڕاوەشاند: «دەی، پرسیاری لێبکە!»

کوڕەکە لەکچەکە نزیک بووەوە، کاتێکیش کچەکە خنی، کوڕەکە بزەیکرد.

پرسی، «ناوت چییە؟»

کچەکە چاوەکانی لەسەر کوڕەکە لابرد و گوتی، «فاتیمە.»

«چەند ژنێکیش لەوڵاتەکەی من هەمان ناویان هەیە.»

فاتیمە گوتی، «ئەوە ناوی کچی پێغەمبەرە. داگیرکارەکان ئەو ناوەیان لەهەموو شوێنێک بڵاوکردووەتەوە.» کچە جوانەکە

بەشانازییەوە باسی داگیرکارەکانی دەکرد.

پیاوە ئینگلیزەکە پاڵی بەکوڕەکەوە نا و کوڕەکەش پرسیاری لەبارەی ئەو پیاوەوە کرد، کە دەتوانێ نەخۆشی چاک بکاتەوە.

گوتی، «ئەوە ئەو پیاوەیە، کە هەموو نهێنییەکانی جیهان دەزانێ. قسە لەگەڵ جنۆکەکانی بیابان دەکات.»

جنۆکەکان ڕۆحی باشە و خراپە بوون. کچەکە ئاماژەی بۆ باشوور کرد، کە گوایا پیاوە سەیرەکە لەوێ دەژیا. ئەوجا گۆزەکەی پڕکرد لەئاو و ڕۆیشت.

پیاوە ئینگلیزەکەش ون بوو، ڕۆیشت کیمیاگەرەکە بدۆزێتەوە. کوڕەکەش بۆ ماوەیەک بەتەنیشت بیرەکەوە دانیشت، بیری کەوتەوە ڕۆژێک لەتاریفە بای مەشرق بۆنی ئەو کچەی بۆ هێنابوو، پێشی وابوو بەرلەوەی بزانێ بوونی هەیە، عاشقی بووبێ. دەیزانی خۆشەویستیی بۆ کچەکە وای لێدەکات هەموو سامانەکانی جیهان بدۆزێتەوە.

ڕۆژی دواتر، کوڕەکە گەڕایەوە بۆلای بیرەکە، ئاواتی دەخواست کچەکە ببینێ. بۆ سەرسوڕمانی ئەو، پیاوە ئینگلیزەکەش لەوێبوو و چاوی لەبیابانەکە بڕیبوو.

گوتی، «تەواوی پاشنیوەڕۆ و ئێوارە چاوەڕێ بووم. لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم ئەستێرەی بەیانییدا، ئەویش هات. پێم گوت بەدووی چیدا دەگەڕێم، ئەویش پرسی گەر هەرگیز توانیبێتم قوڕقوشم بگۆڕم بەئاڵتوون. پێم گوت منیش هاتووم تا فێری ئەوە ببم.

«پێی گوتم دەبێ هەوڵ بدەم. ئەمە هەموو ئەوەبوو، کە گوتی: بڕۆ هەوڵ بدە.»

کوڕەکە هیچی نەگوت. پیاوە ئینگلیزە داماوەکە تەواوی ئەو






ڕێگەیەی بڕیبوو، تا ئەوەی پێبگوترێ، کە پێشتر چەندینجار پێی گوترابوو.

بەپیاوە ئینگلیزەکەی گوت، «دەی تۆش هەوڵ بدە.»

هەر کە پیاوە ئینگلیزە ڕۆیشت، فاتیمە هات و گۆزەکەی پڕکرد لەئاو.

کوڕەکە گوتی، «هاتوومەتە ئێرە تا یەک شتت پێبڵێم. دەمەوێ ببی بەژنم. خۆشم دەوێیت.»

کچەکە گۆزەکەی لێکەوتە خوارەوە و ئاوەکە ڕژا.

«هەموو ڕۆژێ لێرە چاوەڕوانت دەکەم. بیابانەکەم بەهۆی سامانێکەوە بڕیووە، کە لەشوێنێکی نزیک هەڕەمەکانە، بەلای منەوە ئەم جەنگە نەفرین بوو. بەڵام ئێستا دەزانم بەرەکەتە، چونکە تۆی پێئاشناکردم.»

کچەکە گوتی، «ڕۆژێک دێ جەنگەکە تەواو ببێ.»

کوڕەکە تەماشایەکەی دارخورماکانی چواردەوری کرد. بەبیری خۆی هێنایەوە، کە ئەو شوان بووە و دەشتوانێ ڕۆژێک لەڕۆژان ببێتەوە بەشوان. فاتیمە زۆر لەسامانەکەی گرنگتر بوو.

هەر وەک بڵێی پێی زانیووە کوڕەکە بیر لەچی دەکاتەوە، کچەکە گوتی، «پیاوی هۆزەکان هەمیشە بۆ سامان دەگەڕێن. ژنانی بیابانیش شانازی بەپیاوەکانیانەوە دەکەن.»

گۆزەکەی پڕکردەوە و ڕۆیشت.

هەموو ڕۆژێ کوڕەکە دەچوو بۆلای بیرەکە تا چاوی بەفاتیمە بکەوێ. باسی ڕۆژانی شوانیی خۆی و پاشاکە و دوکانی کریستاڵەکەی بۆ کرد. بوونە هاوڕێ و جگە لەو پانزە خولەکەش، کە ڕۆژانە لەگەڵ ئەو بەسەریدەبرد ، تەواوی ڕۆژەکان ناکۆتا دیاربوون. کاتێ نزیکەی مانگێک بەسەر مانەوەی لەمێرگەکە تێپەڕی، ڕابەرەکە

هەموو گەشتیارەکانی بۆ کۆبوونەوەیەک بانگکرد.

گوتی، «نازانین کەی جەنگەکە کۆتایی دێت، لەبەر ئەوە ناتوانین درێژە بەگەشتەکەمان بدەین. دەشێ جەنگەکە ماوەیەکی زۆر بخایەنێ، ڕەنگە تەنانەت چەند ساڵێکیشی پێبچێ. چەکداری بەهێز لەهەردوو لادا هەیە و جەنگەکەش بۆ هەردوو لا گرنگە. ئەمە جەنگی چاکە نییە دژی خراپە. ئەمە جەنگێکە لەنێوان هێزەکاندا بۆ هاوسەنگکردنی دەسەڵات، کاتێکیش ئەم جۆرە جەنگە هەڵدەگیرسێ، لەشەڕەکانی تر زیاتر دەخایەنێ — چونکە ئەڵڵا یارمەتی هەردوو لا دەدات.»

خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان و ئەو پاشنیوەڕۆیەش کوڕەکە ڕۆیشت تا چاوی بەفاتیمە بکەوێ. باسی کۆبوونەوەکەی ئەو بەیانییەی بۆ کرد. فاتیمە گوتی، «ڕۆژێک لەپاش ئەوەی یەکمان بینی، پێت گوتم منت خۆشدەوێ. ئەوجا شتێکت لەبارەی زمانی گەردوونی ڕۆحی جیهانەوە فێرکردم. لەبەر ئەو هۆیەش، من بووم بەبەشێک لەتۆ.»

کوڕەکە گوێی بۆ دەنگی دەگرت، پێشی وابوو زۆر لەدەنگی بای ناو دارخورماکان خۆشتربێ.

«ماوەیەکی زۆرە لەم مێرگەدا چاوەڕێی تۆ دەکەم. ڕابردوو و نەریت و ئەو ڕێگەیەم لەیادکردووە، کە پیاوانی بیاباننشین چاوەڕێ دەکەن ژنان بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن. هەر لەکاتی منداڵیمەوە پێم وابووە بیابانەکە دیارییەکم پێشکەش بکات. ئێستا دیارییەکەم گەیشتووە، ئەوەش تۆیت.»

کوڕەکە دەیویست دەستی بگرێ. بەڵام دەستەکانی فاتیمە بەدەسکی گۆزەکەوە بوون.

«باسی خەونەکانت و پاشا پیرەکە و سامانەکەت بۆ کردم

باسی پێشهاتیشت کرد. لەبەر ئەوە ئێستا لەهیچ شتێ ناترسم، چونکە هەر ئەو پێشهاتانە تۆیان هێناوە بۆلای من. منیش بەشێکم لەخەونەکەت، وەک خۆت گوتت، بەشێکم لەچارەنووست.

«هەربۆیە دەمەوێ لەسەر ئامانجەکەت بەردەوام بی. ئەگەر پێویستدەکا چاوەڕێ بکەی تا جەنگەکە کۆتایی دێت، کەواتە چاوەڕوانبە. بەڵام گەر دەبێ بەر لەو کاتە بڕۆی، بڕۆ و بەدووی خەونەکەت بکەوە. بایەکە گردەباکان دەگۆڕێ، بەڵام هەرگیز بیابانەکە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. خۆشەویستی من و تۆش هەر بەو شێوەیەیە.

«مەکتوب. ئەگەر بەشێک بم لەخەونەکەت، ئەوا ڕۆژێک دەگەڕێیتەوە.» ئەوەشی بۆ زیادکرد.

ئەو ڕۆژە کە فاتیمە بەجێی هێشت، کوڕەکە غەمبار بوو. بیری لەهەموو ئەو شوانانە کردەوە، کە ئەم دەیناسین و هاوسەرگیرییانکردبوو. کاتێکی زۆریان بەقایلکردنی ژنەکانیانەوە بەسەردەبرد، کە دەبوو بڕۆن بۆ کێڵگەی دوور. خۆشەویستی داوایان لێدەکا لەگەڵ ئەو کەسانە بمێننەوە، کە خۆشیان دەوێن.

لە چاوپێکەوتنی دواتریاندا ئەوەی بەفاتیمە گوت.

فاتیمە گوتی، «بیابانەکە پیاوەکانمان لێدەسەنێ و مەرجیش نییە هەمیشە بگەڕێنەوە. ئەوانەی ناگەڕێنەوە دەبنە بەشێک لەهەورەکان، دەبنە بەشێک لەو ئاژەڵانەی لەدۆڵەکاندا خۆیان دەشارنەوە و دەبنە بەشێک لەو ئاوەی لە زەوی هەڵدەقوڵێ. دەبنە بەشێک لەهەموو شتێ ... ئەوان دەبنە ڕۆحی جیهان.

«لەبەر ئەوە بگەڕێرەوە. ژنەکانی دیکەش دڵیان بەوە خۆشە، کە پێیان وایە ڕەنگە ڕۆژێک لەڕۆژان پیاوەکانیان بگەڕێنەوە. واڕاهاتووم تەماشای ئەو ژنانە بکەم و ئیرەیی بەشادییەکەیان بەرم.







ئێستا منیش دەبمە یەکێک لەوانەی چاوەڕێ دەکەن.

«من کچێکی بیابانشینم و شانازیشی پێوە دەکەم. دەمەوێ مێردەکەم هێندەی ئەو بایە ئازاد بێ، کە گردەباکان دروست دەکات. ئەگەر ناچاریش بم، ئەوا ئەو ڕاستییە قبوڵ دەکەم، کە بووەتە بەشێک لەهەورەکان، لەئاژەڵەکان و ئاوی بیابانەکە.»

کوڕەکە ڕۆیشت بەدوای پیاوە ئینگلیزەکەدا بگەڕێ. دەیویست باسی فاتیمەی بۆ بکا. سەری سوڕما کاتێ بینی پیاوە ئینگلیزەکە لەدەرەوەی چادرەکەی فرنێکی بۆخۆی دروستکردووە. فرنێکی سەیربوو و بەدار کاریدەکرد، لەسەرەوە بۆرییەکی گەرمکردنی پێوەبوو. کاتێ پیاوە ئینگلیزەکە تەماشای بیابانەکەی کرد، چاوەکانی لەو کاتە ڕوونتر دیاربوون، کە کتێبەکانی دەخوێندەوە.

گوتی، «ئەمە یەکەم قۆناغی کارەکەمە. دەبێ گۆگردەکە جیابکەمەوە. بۆ ئەوەی ئەمەش بەسەرکەوتویی ئەنجام بدەم، نابێ ترسی شکستم هەبێ. هەر ترسی سەرنەکەوتنبوو لەهەوڵدان بۆ کاری ناوازە وەستانمی. ئێستاش دەست بەوە دەکەم، کە دەمتوانی دە ساڵ پێش ئێستا بیکەم. بەڵام لانی کەم خۆشحاڵم، کە بیست ساڵ چاوەڕێم نەکردووە.»

لەسەر خۆشکردنی ئاگرەکە بەردەوام بوو، کوڕەکەش مایەوە تا ئەو کاتەی خۆرئاوابوون بیابانەکەی پەمەیی کرد. دەیویست بڕواتە ناو بیابانەکە، تا بزانێ گەر بێدەنگییەکەی وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە.

بۆ ماوەیەک سوڕایەوە، لەدارخورماکانی مێرگەکەی دەڕوانی. گوێی بۆ دەنگی باکە دەگرت و هەستی بەبەردەکانی ژێر پێی دەکرد. سەدەفێکی دۆزییەوە و پێی وابوو ڕۆژێک لەڕۆژان بیابانەکە دەریا بووبێ. لەسەر بەردێک دانیشت و ڕێگەیدا ئاسۆ بیخاتە خەواندنێکی

خۆییەوە. هەوڵیدەدا بەشێوەیەکی جیاواز مامەڵە لەگەڵ چەمکی خۆشەویستی و سامان بکات، بەڵام بۆی جیانەدەکرایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا فاتیمە ئافرەتێکی بیابانشین بوو، ئەگەر شتێک هەبایە و یارمەتی تێگەیشتنی کوڕەکەی بدابا، بیابانەکە بوو.

کاتێ لەوێدا دانیشتبوو و بیری دەکردەوە، لەسەرووی خۆیەوە جووڵەیەکی بینی. تەماشایکرد و بینی دوو هەڵۆ لەئاسمانێکی بەرزدا دەفڕن.

بینی هەڵۆکان لەهەوادا بەنارێکی دێن و دەچن. وادەردەکەوت فڕینەکەیان نموونەیی نەبێ، ئەوەیش جۆرە هەستێکی جیدی لای کوڕەکە دروستکرد. کێشەکە ئەوەبوو تێنەدەگەیشت مانای ئەو فڕینە چییە. دوای جووڵەی باڵندەکان کەوت و هەوڵیدەدا شتێکیان تیا بخوێنێتەوە. ڕەنگبوو ئەم باڵندە بیابانیانە بیانتوانیبا مانای خۆشەویستی سەربەخۆ بۆ کوڕەکە ڕوونبکەنەوە.

خەوی دەهات. لەناخدا حەزیدەکرد بەئاگابێ، بەڵام دەشیویست بخەوێ. بەخۆی گوت، «خەریکە زمانی جیهان فێردەبم و وردە وردە هەموو شتەکانی جیهان لام واتادار دەبن ... تەنانەت فڕینی هەڵۆکانیش.» بەو حەوسەڵەیەشەوە، بەعاشقبوونی خۆی شادمان بوو. لەبیری خۆیدا گوتی، کاتێ عاشق دەبی، شتەکان هەستیارتر دەبن.

لەناکاو یەکێک لەهەڵۆکان بەخێرایی خۆی لەقووڵایی ئاسماندا نوقوومکرد و هێرشی بۆ ئەوەی تریان برد. لەگەڵ ڕوودانی ئەمەدا، وێنەی کاروانێک هاتە بەر چاوی کوڕەکە: سوپایەک بەشمشێرەکانیانەوە ئامادەبوون مێرگەکە داگیر بکەن. گوێی لێبووبوو خەڵکی باسی تراویلکەیان کردبوو، خۆیشی بینیبووی: تراویلکە کۆمەڵێک ئارەزووە و لەبەر بەهێزییان، لەسەر لمی بیابانەکە دەبنە

واقع. بەڵام خۆ بەدڵنیاییەوە ئەو حەزی بەوە نەکردووە سوپایەک مێرگەکە داگیر بکات.

ویستی ئەو دیمەنە لەیادبکا و دەست بکاتەوە بەتەئەمول. دەیویست دووبارە سەرنجی لەسێبەرە پەمەییەکان و بەردەکانی بیابانەکەدا چڕبکاتەوە. بەڵام شتێک لەناخیدا ڕێگەی لێدەگرت.

پاشا پیرەکە گوتبووی، «هەمیشە گرنگی بەپێشهاتەکان بدە.» کوڕەکە بیری کەوتەوە چی لەدیمەنەکەدا بینیووە و هەستیدەکرد ئەو شتە ببێتە ڕاستی.

هەستا و ڕێگەی بەرەو دارخورماکان گرتەوە بەر. جارێکی دی، لەشتەکانی چواردەوریدا هەستی بەچەندین زمان کرد: ئەمجارەیان بیابانەکە پارێزراوبوو و مێرگەکە بووبووە شوێنێکی ترسناک.

وشترسوارەکە لەسەر ڕەگی دارخورمایەک دانیشتبوو و تێبینی خۆرئاوابوونی دەکرد. بینی کوڕەکە لەبەشی ئەولای گردەباکانەوە دەردەکەوێ.

کوڕەکە گوتی، «سوپایەک دێتە ئێرە. ئەو دیمەنەم بینی.»

وشترسوارەکە لەوەڵامدا گوتی، «بیابانەکە دڵی پیاوان پڕدەکات لەتراویلکە.»

بەڵام کوڕەکە باسی هەڵۆکانی بۆ کرد: کە تێبینی شەڕەکەیانی کردووە و لەناکاو هەستی کردبوو لەڕۆحی جیهاندا نوقووم بووە.

وشترسوارەکە لەقسەکانی کوڕەکە تێگەیشت. دەیزانی هەر شتێکی بەخشراو لەسەر ڕووکاری زەوی دەتوانێ مێژووی هەموو شتەکان دەربخات. مرۆڤ دەتوانێ هەر لاپەڕەیەکی کتێبێک بکاتەوە، یان تەماشای دەستی کەسێک بکات؛ مرۆڤ دەتوانێ کاغەزێ هەڵبگرێتەوە، یان تەماشای شەڕی نێوان باڵندەکان بکات ... هەر شتێ تێبینی بکرێ، مرۆڤ دەتوانێ لەو ساتەدا پەیوەندییەک

لەگەڵ ئەزموونی خۆی دروست بکات. لەڕاستیدا، ئەوە نەبوو ئەو شتانە لەناو خۆیان شتێک دەربخەن؛ ئەوە مرۆڤ بوو، کە دەیتوانی تەماشای ڕوودانی شتەکانی چواردەوری بکا و مانایەک بۆ چوونە ناو ڕۆحی جیهان بدۆزێتەوە.

بیابانەکە پڕبوو لەو مرۆڤانەی گوزەرانیان پشتی بەسانایی چوونە ناو ڕۆحی جیهان بەستبوو. ئەوان پێیان دەگوترا فاڵچی و ژنان و پیرەکان لێیان دەترسان. هۆزنشینەکانیش وریابوون لەڕاوێژ پێکردنیان، چونکە مەحاڵە بتوانی بەشداری شەڕێک بکەی، کە بزانی دەمری.

هۆزنشینەکان وایان بەباشتر دەزانی تامی جەنگ و ئەنجامی نەزاندراو بکەن؛ ئەڵڵا داهاتووی نوسیووە و ئەوەیش کە نووسیوویەتی لەسوودی مرۆڤە. بەو شێوەیەش هۆزنشینەکان تەنیا بۆ ساتی ئێستا دەژیان، چونکە ئێستا پڕیەتی لەکتوپڕی و دەبێ ئاگاداری چەندین شت بی: شمشێری دوژمن لەکوێیە؟ ئەسپەکەی لەکوێیە؟ دەبێ دواتر مرۆڤ چ جۆرە هێرشێک بەرێ تا بەزیندوویی بمێنێتەوە؟ وشترسوارەکە جەنگاوەر نەبوو، لەبەر ئەوە ڕاوێژی بەفاڵچییەکان کردبوو. زۆرینەیان ئەوەی گوتوویانە ڕاست بووە، بەڵام هەندێکیشیان هەڵەبوون. ئەوجا ڕۆژێکیان، بەتەمەنترین فاڵچی تا ئێستا بینیبێتی (کەسێکی زۆر ترسناکیش بوو) لەوشترسوارەکەی پرسیبوو، کە بۆچی هێندە گرنگی بەداهاتوو دەدات.

لەوەڵامدا گوتبووی، «بۆ ئەوەی ... بتوانم شت بکەم. بەو شێوەیەش دەتوانم ئەو شتانە بگۆڕم، کە نامەوێ ڕووبدەن.»

فاڵچییەکە گوتبووی، «بەڵام ئەو کاتە نابن بەبەشێک لەداهاتووت.»

«ڕاستە، ڕەنگە تەنیا بمەوێ بزانم چی لەداهاتوودایە، تا خۆمی

بۆ ئامادە بکەم.»

فاڵگرەوەکە گوتی، «ئەگەر شتێ باش بێ، دەبێتە کتوپڕییەکی دڵخۆشکەر. ئەگەر شتێکیش خراپ بێ، خۆت باش دەزانی، کە بەر لەدەرکەوتنیان غەم دەخۆی.»

وشترسوارەکە بەفاڵگرەوەکەی گوتبوو، «دەمەوێ لەبارەی داهاتووەوە بزانم، چونکە من مرۆڤم. مرۆڤیش هەمیشە بەپشتبەستن بەداهاتوو ژیانیان دەگوزەرێنن.»

فاڵگرەوەکەش لەهەڵدانی لقەکاندا زۆر شارەزابوو؛ هەڵیدەدانە سەر زەوییەکە و بەپێی کەوتنەخوارەوەیان لێکدانەوەیدەکرد. ئەو ڕۆژە لقەکانی هەڵنەدا. پارچە پەڕۆیەکی تێوەپێچان و خستنیە ناو جانتاکەی.

گوتی، «من بەپێشبینیکردنی داهاتووی خەڵکی ژیان دەگوزەرێنم. زانستی لقەکان شارەزام و دەزانم چۆن بیانخەمە ئەو شوێنەی هەموو شتێکی تێدا نووسراوە. لەوێدا دەتوانم ڕابردوو بخوێنمەوە، ئەوەی لەیاد کراوە بیدۆزمەوە و لەپێشهاتەکانی ئێستا تێبگەم.

«کاتێ خەڵکی ڕاوێژم پێدەکەن، بابەتەکە ئەوە نییە من داهاتوو بخوێنمەوە؛ داهاتوو دەقەبڵێنم. داهاتوو هی خودایە، تەنیا خۆیشی دەتوانێ لەدۆخی نائاساییدا دەریبخات. چۆن داهاتوو دەقەبڵێنم؟ بەپشتبەستن بەپێشهاتەکانی ئێستا. ئەگەر بایەخ بەئێستا بدەی، دەتوانی ئەو سەرنجەت بەرەو پێش بەری. ئەگەر بشتوانی ئێستا بەرەو پێش بەری، ئەوەی دێت باشتر دەبێ. داهاتوو لەیاد بکە و لەسەر فێرکارییەکانی ئەمڕۆ بژی، قایلیش بەبەوەی خودا منداڵەکانی خۆی خۆشدەوێ. هەموو ڕۆژێک لەگەڵ خۆیدا ئەبەدیەت دەهێنێ.»

وشترسوارەکە پرسیبووی ئەو دۆخە نائاساییانە چین، کە خود تێیاندا ڕێگەی پێدەدات داهاتوو ببینێت.

«تەنیا ئەو کاتانەی خودی خۆی دەریاندەخات. خوداش بەدەگمەن داهاتوو ئاشکرا دەکات. کاتێکیش ئاشکرای دەکات، تەنیا لەبەر یەک هۆکارە: ئەوە داهاتوویەکە و بۆ گۆڕین نووسراوە.»

وشترسوارەکە لەبیری خۆیدا گوتی، خودا بەشێکی داهاتووی پیشانی کوڕەکە داوە. بۆچی ویستوویەتی وەک ئامێرێکی خۆی لەخزمەتدا بەکاری بێنێ؟

وشترسوارەکە گوتی، «بڕۆ سەرۆک هۆزەکان ئاگادار بکەرەوە. باسی ئەو سوپایەیان بۆ بکە، کە بەرەو ئێرە دێن.»

«پێم پێدەکەنن.»

«ئەوان بیابانانشینن و فێربوون مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە پێشهاتانە بکەن.»

«دەی کەواتە ئێستا خۆیان دەیزانن.»

«ئێستا بایەخ بەوە نادەن. ئەوان بڕوایان وایە ئەگەر پێویستبکا شتێک بزانن، کە خودا دەیەوێ بیزانن، کەسێک پێیان دەڵێ. پێشتر چەندینجار ئەوە ڕوویداوە. بەڵام ئەمجارە ئەو کەسەی پێیان دەڵێ تۆ دەبی.»

کوڕەکە بیری لەفاتیمە کردەوە. پاشان بڕیاریدا بچێ بۆلای سەرۆک هۆزەکان و پێیان بڵێ.



کوڕەکە لەپاسەوانێکی بەردەم چادرێکی زەبەلاحی سپیی ناوەڕاستی مێرگەکە نزیک بووەوە.

«دەمەوێ چاوم بەسەرۆک هۆزەکان بکەوێ. لەبیابانەکەوە پێشهاتم بۆ هێناون.»

بەبێ وەڵامدانەوە، پاسەوانەکە ڕۆیشتە ناو چادرەکەوە و ماوەیەک مایەوە. کاتێ گەڕایەوە، عەرەبێکی لاوی لەگەڵدا بوو، لەبەرگێکی سپی و ئاڵتوونییدا بوو. کوڕەکە بەپیاوە لاوەکەی گوت چی بینیووە، ئەویش پێی گوت لەوێ چاوەڕێ بکات. لەچادرەکەدا دیارنەما.

شەو داهات و کۆمەڵێک جەنگاوەر و بازرگان دەچوونە ناو خێمەکە و دەهاتنە دەرەوە. یەک بەیەک ئاگرەکانی چادرگەکە کوژانەوە و مێرگەکەش بەشێوەی بیابانەکە هێمنیی بەسەردا کشا. تەنیا ڕووناکییەکانی چادرە گەورەکە مانەوە. لەتەواوی ئەو ماوەیەدا کوڕەکە بیری لەفاتیمە دەکردەوە و هێشتاش لەدوایین گفتوگۆی نێوان خۆی و ئەو تێنەدەگەیشت.

لەکۆتاییدا، لەپاش چەند کاتژمێرێک چاوەڕوانی، سەربازەکە ڕێگەی بەکوڕەکەدا بچێتە ژوورێ. سەری لەوە سوڕمابوو، کە لەناوەوە دەیبینی. هەرگیز وێنای نەکردبوو لەناوەڕاستی بیابانەکەدا چادرێکی لەو شێوەیە هەبێ. زەوییەکە بەجوانترین مافوور داپۆشرابوو، کە هەتا ئێستا پێی بەسەردا نابێ، لەسەریشەوە چەند چرایەکەی دەستکردی ئاڵتوون هەڵواسرابوون، کە هەر یەکەیان مۆمێکی تێدا دەسووتا. سەرۆک هۆزەکان لەچادرەکەدا بەشێوەیەکی نیمچەبازنەیی دانیشتبوون، شانیان لەسەر سەرینی گرانبەهای بەئاوریشم چندراو دادابوو. خزمەتکارەکان بەسینی زیوینەوە، کە دارچینی و چای لەسەر بوو، دەهاتنە ژوورێ و دەڕۆیشتن. کۆمەڵێک خزمەتکاری تر خەڵووزیان بۆ نێرگیلەکان دەهێنا. کەشەکە بەبۆنێکی شیرینی دووکەڵ داپۆشرابوو.

هەشت سەرۆک هۆزی لێبوو، بەڵام کوڕەکە یەکسەر بۆیدەرکەوت کامیان لەهەموویان گرنگترە: عەرەبێک، کە بەرگی سپی و ئاڵتوونیی لەبەردابوو، لەناوەڕاستی نیمچەبازنەکەدا دانیشتبوو، بەتەنیشتیەوە



ئەو لاوە عەرەبەی لێبوو، کە پێشتر کوڕەکە قسەی لەگەڵ کردبوو. یەکێک لەسەرۆک هۆزەکان چاوی لەکوڕەکە بڕیبوو و لێی پرسی، «ئەو بێگانەیە کێیە باسی پێشهات دەکات؟»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «ئەو کەسە منم.» ئەوجا باسی ئەوەی کرد، کە بینیبووی.

سەرۆک هۆزێکی تر پرسی، «بۆچی بیابانەکە شتی لەو جۆرە بۆ تۆ دەردەخات، لەکاتێکدا دەزانێ ئێمە بۆ ماوەی چەندین نەوەیە لێرە دەژین؟»

کوڕەکە گوتی، «چونکە هێشتا چاوەکانم بەبیابانەکە ڕانەهاتوون. من شتگەلێک دەبینم، کە ڕەنگە ئەو چاوانەی خویان بەبیابانەکەوە گرتووە نەیبینن.»

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، لەبەر ئەوەش، کە بەڕۆحی جیهان ئاشنام.

سێیەم سەرۆک هۆز گوتی، «مێرگەکە زەوییەکی بێلایەنە. کەس هێرش ناکاتە سەر مێرگێک.»

«من تەنیا دەتوانم ئەوەتان پێبڵێم، کە بینیومە. ئەگەر ناتانەوێ باوەڕم پێبکەن، پێویست ناکا هیچ شتێکی بۆ بکەن.»

پیاوەکان دەستیان بەگفتوگۆ کرد. بەشێوە زارێکی عەرەبی قسەیاندەکرد، کە کوڕەکە تێنەدەگەیشت، بەلام کاتێ ویستی بڕوا، پاسەوانەکە داوای لێکرد بمێنێتەوە. کوڕەکە ترسی لێنیشت؛ پێشهاتەکان پێیان دەگوت شتێکی خراپ لەئارادایە. پەشیمانبوو لەوەی بەوشترسوارەکەی گوتبوو، کە چی لەبیابانەکەدا بینبیوو.

لەناکاو عەرەبە بەتەمەنەکەی ناوەڕاست لەبەر خۆیەوە بزەیکرد و کوڕەکەش هەستی باشتر بوو. ئەو پیاوە بەشداری گفتوگۆکەی نەکرد، لەڕاستیدا، هەر هیچ وشەیەکی لەسەر ئەو بابەتە نەگوت.







بەڵام تازە کوڕەکە فێری زمانی جیهان بووبوو و دەیتوانی ئاشتی لەناو چادرەکەدا هەست پێبکات. ئێستا بەڵگەنەویست بوو، کە هاتنەکەی شتێکی باش بوو.

گفتوگۆکە کۆتایی پێهات. سەرۆک هۆزەکان بۆ ساتێک بێدەنگ بوون، تا گوێ بۆ عەرەبە بەتەمەنەکە بگرن. ئەوجا ڕووی بۆ کوڕەکە وەرگێڕا: ئەمجارەیان ڕووخسارێکی ساردی هەبوو.

بەو شێوەزارەی کوڕەکە لێی تێدەگەیشت، عەرەبە بەتەمەنەکە گوتی، «دوو هەزار ساڵ بەر لەئێستا، پیاوێک، کە بڕوای بەخەون دەکرد، خرایە زیندانەوە و وەک کۆیلە فرۆشرا. بازرگانەکانمان پیاوەکەیان کڕی و هێنایانەوە بۆ میسر. هەمووومان دەزانین ئەوەی بڕوای بەخەون هەبێ، دەشزانێ لێکی بداتەوە.»

پیاوە بەتەمەنەکە بەردەوام بوو، «کاتێ فیرعەون خەونی بەمانگای قەڵەو و مانگای لاوازەوە بینیبوو، ئەم پیاوە میسری لەگرانی و برسێتی ڕزگارکرد. ناوی یوسف بوو. ئەویش بێگانەبوو لەخاکێکی بێگانەدا، هەر بەشێوەی تۆ، بەدڵنیاییەوە لەتەمەنی تۆشدا بوو.»

وەستا و هێشتا چاوەکانی تووڕە دیاربوون.

«ئێمە هەمیشە تێبینی نەریت دەکەین. لەو ڕۆژگارەدا نەریت میسری لەگرانی ڕزگارکرد و میسرییەکانی کردە دەوڵەمەندترین. نەریت مرۆڤ فێردەکات چۆن لەبیابانەکە بپەڕێنەوە و دەبێ چۆن منداڵەکانیان هاوسەرگیری بکەن. نەریت پێمان دەڵێ مێرگ زەوییەکی بێلایەنە، لەبەر ئەوەش هەردوو لا مێرگی تێدایە، چونکە هەردوو لا بیهێنن.»

یەک کەس قسەی نەدەکرد کاتێ پیاوە بەتەمەنەکە بەردەوام بوو.

«بەڵام نەریت پێشمان دەڵێ دەبێ بڕوا بەپەیامی بیابانەکە بکەین. هەر شتێ کە دەیزانین، لەبیابانەکەوە فێری بووین.»

پیاوە بەتەمەنەکە ئاماژەیەکیکرد و هەموویان هەستانە سەر پێ. دانیشتنەکە کۆتایی پێهاتبوو. نێرگیلەکان کوژێندرانەوە و پاسەوانەکان بەوریایی وەستابوون. کوڕەکە ئامادەی ڕۆیشتن بوو، بەڵام دووبارە پیاوە بەتەمەنەکە دەستی بەقسەکردن کردەوە.

«سبەی ئەو ڕێکەوتنە دەشکێنین، کە دەڵێ نابێ کەس لەمێرگەکە چەکی پێبێ. لەتەواوی ڕۆژەکەدا بۆ هاتنی دوژمن دەگەڕێین. کاتێ خۆر ئاوادەبێ، دووبارە جارێکی تر پیاوەکان چەکەکانیان دەدەنەوە بەمن. بۆ کوژرانی دە دوژمن، پارچەیەک ئاڵتوون وەردەگری.

«بەڵام چەک دانانرێ هەتا جەنگی پێنەکرێ. چەکیش وەک بیابان ڕاڕایە، ئەگەر بەکار نەهێندرێن، ئەوا ڕەنگە جاری داهاتوو کاری خۆیان جێبەجێ نەکەن. ئەگەر هەتا کۆتایی سبەی چەکێک بەکار نەهێندرا، ئەوا لەتۆدا بەکاردەهێندرێ.»

کاتێ کوڕەکە چادرەکەی بەجێ هێشت، بیابانەکە تەنیا بەڕووناکی هەیڤ ڕووناک بووبووەوە. بیست خولەک لەچادرەکەیەوە دووربوو و دەستیکرد بەڕۆیشتن بەرەو ئەوێ.

لەوە ئاگادار کرابووەوە کە ڕوویدابوو. توانیبیووی بگاتە ناو ڕۆحی جیهان، ڕەنگە نرخی ئەوەش بەخشینی ژیانی بێ. گرەوێکی مەترسیداربوو. بەڵام هەر لەو ڕۆژەوەی مەڕەکانی فرۆشت بۆ ئەوەی بەدووی خەونەکەی بکەوێ، گرەوی مەترسیداری کردبوو. بەڵام وەک وشترسوارەکەش گوتی، مردن لەسبەیدا هیچ لەوە خراپتر نییە لەهەر ڕۆژێکی تردا بمری. هەموو ڕۆژێک کەسێک لەم جیهانەدا دەژی یا بەجێی دێڵێ. هەموو شتەکان پشتیان بەیەک وشە بەستووە: «مەکتوب.»







بەبێ دەنگی پیاسەیدەکرد و هیچ پەشیمان نەبوو. ئەگەر سبەی بمردبا، لەبەر ئەوەبوو، کە خودا ویستی لەسەر گۆڕینی داهاتوو نەبووە. لانیکەم دوای ئەوە دەمرد، کە لەدەربەندەکە پەڕییەوە، لەدوکانی کریستاڵەکەدا کاریکرد و دوای ئەوەی بەبێدەنگی بیابانەکە و چاوەکانی فاتیمە ئاشنابوو. لەو ڕۆژەوەی ماڵەوەی بەجێ هێشتووە، هەر تاکە ڕۆژێکی بەمەزنی بەسەربردووە. ئەگەر بەیانی بمردبا، کێشە نەبوو، چونکە لەشوانەکانی دیکە زیاتری بینیبوو و شانازیشی بەوەوە دەکرد.

لەناکاو گوێی لەدەنگی هەورەتریشقەبوو و بەبایەکی سەیر کەوتە سەر زەوییەکە. گەردەلوولێکی چڕ لەتەپوتۆز دروستبووبوو، کە بووبووە هۆی شاردنەوەی هەیڤەکە. هەسپێکی زەبەلاح لەبەردەمیدا و لەسەر دوو قاچی پاشەوەی وەستابوو و دەنگێکی ترسناکی دەردەکرد.

کاتێ کەمێک تۆزەکە ڕەوییەوە، کوڕەکە لەترسی ئەوەی بینی، گیانی کەوتە لەرزە. ئەسپسوارێکی بەرگ ڕەش بەسواری ئەسپەکەوەبوو و بازێک بەسەر شانی چەپییەوە بوو. سەرپێچێکی ڕەشی پێچابوو و تەواوی دەموچاویشی، جگە لەچاوەکانی، بەپەڕۆیەکی ڕەش داپۆشرابوو. لەپەیامنێرێکی بیابان دەچوو، بەڵام هاتنی زۆر لەپەیامنێرێک بەهێزتربوو.

ئەسپسوارەکە شمشێرێکی زەبەلاحی لەکێلانێک دەرهێنا، کە بەزینی ئەسپەکەیەوە جێگیرکرابوو. پۆڵای تیغەکەی لەبەر ڕووناکی هەیڤەکەدا دەبریسکایەوە.

گوتی، «کێ وێرای لێکدانەوە بۆ فرینی هەڵۆکان بکات؟»

هێندە بەدەنگی بەرز ئەمەی گوت، کە وادیاربوو دەنگی لەناو هەر پەنجاهەزار دارخورماکەی ئەلفەیومدا دەنگ بداتەوە.







کوڕەکە گوتی، «ئەو کەسە من بووم.» سانتیاگۆ ماتۆمۆرۆسی بەبیر هاتەوە، کە بەسواری ئەسپەکەیەوەبوو و بێباوەڕەکانیش لەبەر سمی ئەسپەکەدا بوون. ئەم پیاوەش ڕێک هەمان دیمەنی هەبوو، بەڵام ئێستا ڕۆڵەکان پێچەوانە بووبوونەوە.

سەری نزمکردەوە تا شمشێرێکی پێدا بکێشرێ و دووبارە گوتی، «ئەو کەسە من بووم. چەندین ژیان پارێزراو دەبن، چونکە توانیومە لەڕۆحی جیهانەوە تەماشای شتەکان بکەم.»

شمشێرەکەی پیا نەکێشرا. لەجێی ئەوە، بەهێواشی هێنایە خوارێ، تا نووکەکەی گەیشتە سەر ناوچاوانی کوڕەکە، دڵۆپێ خوێنی لێهێنا.

ئەسپسوارەکەش، هەر بەشێوەی کوڕەکە، لەشوێنی خۆی نەدەجووڵا. هەر وایش دەرنەکەوت کوڕەکە بیەوێ هەڵبێ. لەوێدا، هەستی بەشادییەکی سەیر دەکرد: خەریکبوو لەپێناو بەدووکەوتنی خەونەکەیدا دەمرد. هەروەها لەپێناوی فاتیمەشدا. لەپاش هەموو شتێکیش، پێشهاتەکان ڕاستیانکردبوو. ئەوەتا لێرەدا ڕووبەڕووی دوژمنەکەی بووبوووەوە، بەڵام پێویستی نەدەکرد بیر لەمردن بکاتەوە – ڕۆحی جیهان چاوەڕێیدەکرد و بەو زووانە دەبووە بەشێک لەو. سبەی دوژمنەکەشی دەبووە بەشێک لەو ڕۆحە.

بێگانەکە شمشێرەکەی هەر لەسەر ناوچاوانی کوڕەکە ڕاگرتبوو. «بۆچی لێکدانەوەت بۆ فڕینی باڵندەکان کرد.»

«تەنیا ئەوەم خوێندەوە، کە باڵندەکان دەیانویست پێمی بڵێن. ئەوان دەیانویست مێرگەکە ڕزگار بکەن. سبەی هەمووتان دەمرن، چونکە پیاوانی مێرگەکە ژمارەیان لەئێوە زیاترە.»

شمشێرەکە لەشوێنی خۆی مایەوە. «تۆ چیت تا ئەوە بگۆڕی، کە ئەڵڵا ویستی لەسەرە؟»







کوڕەکە بیری وشەکانی وشترسوارەکەی هاتەوە و گوتی، «ئەڵڵا سوپاکانیش و هەڵۆکانیشی دروستکردووە. ئەڵڵا زمانی باڵندەکانی فێری من کردووە. هەموو شتێک لەلایەن هەمان دەستەوە نووسراوە.»

بێگانەکە شمشێرەکەی لەسەر ناوچاوانی کوڕەکە لابرد و ئەویش هەستی بەخۆشییەکی زۆر کرد. بەڵام هێشتا نەیدەتوانی بڕوات.

بێگانەکە گوتی، «وریای پێشبینییەکانت بە. ئەگەر شتێ نووسرابێ، هیچ ڕێگەیەک بۆ گۆڕینی نییە.»

کوڕەکە گوتی، «ئەوەی بینیم سوپایەک بوو. ئەنجامی جەنگەکەم نەبینی.»

وادیاربوو بێگانەکە بەوەڵامەکە قایل بێ. بەڵام هێشتا شمشێرەکەی بەدەستەوەبوو. «بێگانەیەک لەخاکی بێگانەدا چی دەکات؟»

«دوای چارەنووسی خۆم کەوتووم. ئەوە شتێ نییە تۆ لێی تێبگەی.»

بێگانەکە شمشێرەکەی خستەوە ناو کێلانەکەی و کوڕەکەش حەوایەوە.

بێگانەکە گوتی، «دەبوو ئازایەتیت تاقی بکەمەوە. ئازایەتی لەهەموو شتێکی تر بنچینەییترە بۆ تێگەیشتن لەزمانی جیهان.»

کوڕەکە سەری سوڕمابوو. بێگانەکە باسی شتگەلێکی دەکرد، کە کەم کەسان لەبارەیەوە دەیزانن.

بەردەوامبوو، «نابێ کۆڵ بدەی، تەنانەت لەپاش ئەوەی ئەم ڕێگە درێژەشت بڕیووە. پێویستە بیابانەکەت خۆش بوێ، بەڵام هەرگیز بەتەواوەتی باوەڕی پێمەکە. چونکە بیابانەکە هەموو مرۆڤەکان تاقی دەکاتەوە: ململانێی هەموو هەنگاوێک دەکا و ئەوانە دەکوژێ، کە چاوپۆشی دەکەن.»

ئەوەی گوتی، پاشا پیرەکەی بەبیری کوڕەکە هێنایەوە.

بێگانەکە گوتی، «ئەگەر جەنگاوەرەکان هاتن بۆ ئێرە و هێشتا لەکاتی خۆرئاوابووندا سەرت بەسەر شانەکانتەوە بوو، وەرە و بمدۆزەرەوە.»

هەمان ئەو دەستەی شمشێرێکی ڕاکێشابوو، ئێستا قامچییەکی گرتبوو. ئەسپەکە کەوتەوە سەر پاشکۆی و هەورێکی لەخۆڵ دروستکرد.

لەگەڵ دوورکەوتنەوەی ئەسپسوارەکەدا هاواریکرد، «لە کوێ دەژیت؟»

ئەو دەستەی قامچییەکەی گرتبوو، ئاماژەی بۆ باشوور کرد.

کوڕەکە چاوی بەکیمیاگەرەکە کەوتبوو.



بەیانی دواتر دوو هەزار پیاوی چەکدار لەناو دارخورماکانی ئەلفەیومدا جێگیر کرابوون. بەر لەوەی خۆر بگاتە بەرزترین خاڵی خۆی، پێنج سەد پیاوی هۆزنشین لەئاسۆوە دەرکەوتن. سوپای ئەسپسوار لەباکوورەوە هاتنە ناو مێرگەکەوە؛ لەهەڵمەتێکی ئاشتییانە دەچوو، بەڵام هەموویان چەکیان لەژێر دشداشەکانیانەوە شاردبووەوە. کاتێ گەیشتنە چادرە سپییەکەی ناوەڕاستی ئەلفەیوم، شمشێر و تفەنگەکانیان دەرهێنا. پاشان هێرشیانکردە سەر چادرێکی بەتاڵ.

پیاوانی مێرگەکە دەوری ئەسپسوارە بیابانشینەکانیاندا و لەماوەی نیو کاتژمێردا، جگە لەیەکێکیان، تەواوی داگیرکارەکان کوژران. منداڵەکان بۆ بێستانی بەشی ئەولای دارخورماکان دوور خرابوونەوە

و هیچ کام لەوانەیان نەدەبینی، کە ڕوویدەدا. ژنەکان لەچادرەکانی خۆیاندا مابوونەوە و نزای پارێزگارییان بۆ مێردەکانیان دەکرد، ئەوانیش هیچیان لەجەنگەکە نەبینی. ئەگەر جەستە بێگیانەکانی سەر زەوییەکە نەبایە، هەر لەڕۆژێکی ئاسایی مێرگەکە دەچوو.

تاکە هۆزنشین کە پارێزراو بوو، سەرتیپەکە بوو. ئەو پاشنیوەڕۆیە، هێندرایە بەردەمی سەرۆک هۆزەکان و لێی پرسرا بۆچی سەرپێچی لەنەریتەکاندا کردووە. سەرتیپەکە گوتی، پیاوەکانی برسی و تینوو و ماندووی چەندین ڕۆژی جەنگبوون، لەبەر ئەوە بڕیاریان دابوو مێرگەکە داگیر بکەن، تا بتوانن بۆ جەنگ بگەڕێنەوە.

سەرۆک هۆزەکە گوتی بەزەیی بەهۆزنشینەکاندا دێتەوە، بەڵام نەریتەکان پیرۆزن. فەرمانیکرد سەرتیپەکە بەڕوو سیایی بکوژرێ. لەجێی ئەوەی بەتیغێک یا گوللەیەک ژیانی کۆتایی پێبهێندرێ، بەدارخورمایەکی وشکبوودا لەسێدارە درا و بای بیابانیش جەستەی دەجووڵاندەوە.

سەرۆک هۆزەکە بانگی کوڕەکەی کرد و پەنجا پارچە ئاڵتوونی پێدا. چیرۆکی میسر و یوسفی بۆ دووبارەکردەوە و داوای لێکرد ببێتە ڕاوێژکاری مێرگەکە.



کاتێ خۆر ئاوابوو و یەکەمین ئەستێرەکان دەرکەوتن، کوڕەکە بەرەو باشوور کەوتە ڕێ. پاشان چاوی بەتاکە چادرێک کەوت و کۆمەڵە عەرەبێکیش کە بەلایدا تێپەڕین، بەکوڕەکەیان گوت ئەو شوێنە پڕیەتی لەخێو. بەڵام کوڕەکە دانیشت و چاوەڕێیکرد.

هەتا هەیف بەبەرزایی ئاسمانەوە هەڵنەواسرا، کیمیاگەرەکە

دەرنەکەوت. دوو هەڵۆی مردارەوەبووی لەسەر شانی هەڵگرتبوو.
کوڕەکە گوتی، «لێرەم.»
کیمیاگەرە گوتی، «نەدەبوو لێرە بی. یان چارەنووست تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟»
«لەبەر جەنگی هۆزەکان، زەحمەتە لەبیابانەکە بپەڕیتەوە. لەبەر ئەوە هاتم بۆ ئێرە.»
کیمیاگەرەکە لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارێ و ئاماژەیکرد کوڕەکەش لەگەڵیا بچێتە ناو چادرەکەوە. چادرێکبوو وەک هەموو چادرەکانی دیکەی مێرگەکە. کوڕەکە بۆ فڕن و ئەو دەزگایانەی دیکە دەگەڕا، کە لەکیمیادا بەکاردێن، بەڵام هیچی نەبینی. تەنیا کۆمەڵە کتێبێک، فڕنێکی بچووکی چێشتلێنان و ئەو مافوورانەی لێبوو، کە بەنەخشی سەیر داپۆشرابوون.
کیمیاگەرەکە گوتی، «دانیشە. دەبێ شتێ بخۆینەوە و ئەم هەڵۆیانەش بخۆین.»
کوڕەکە گومانی هەبوو گەر ئەوانە هەمان ئەو هەڵۆیانە بن، کە ڕۆژی پێشوو بینیبوونی، بەڵام هیچی نەگوت. کیمیاگەرەکە ئاگرەکەی داگیرساند، هەر زوو بۆنێکی خۆش چادرەکەی تەنی. زۆر لەبۆنی نێرگیلەکان خۆشتربوو.
کوڕەکە پرسی، «بۆچی ویستت بمبینی؟»
کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «لەبەر پێشهاتەکان. باکە پێی گوتم تۆ دێیت و پێویستیشت بەیارمەتی دەبێ.»
«ئەوەی باکە باسیکردووە، من نیم. ئەوە بێگانەیەکی دیکەیە، پیاوێکی ئینگلیزە. ئەو بەدووی تۆدا دەگەڕێ.»
«ئەو دەبێ یەکەمجار شتی تر بکات. بەڵام لەپێگەیەکی ڕاستدایە. دەستی بەتێگەیشتن لەبیابانەکە کردووە.»







«ئەی من چی؟»

«کاتێ کەسێک بەڕاستی شتێکی گەرەکە، تەواوی گەردوون لەبەدەستهێنانیا یارمەتی دەدەن،» کیمیاگەرەکە ئەمەی گوت، وشەکانی پاشا پیرەکە دەنگی دەدایەوە. کەسێکی دیکەش لێرە هەبوو، تا لەبەدووکەوتنی چارەنووسیدا یارمەتی بدات.

«کەواتە ڕاهێنانم پێدەکەیت؟»

«نەخێر. خۆت هەموو ئەو شتانە دەزانی، کە پێویستە بیانزانی. تەنیا لەنیشاندانی شوێنی سامانەکەتدا یارمەتیت دەدەم.»

دووبارە کوڕەکە گوتی، «بەڵام جەنگی هۆزەکان لەئارادایە.»

«دەزانم چی لەبیابانەکەدا ڕوودەدات.»

«تازە سامانەکەمم دۆزیوەتەوە. وشترێکم هەیە، ئەو پارەیەم پێیە، کە لەدوکانی کریستاڵەکە دەستم کەتووە، پەنجا پارچە ئاڵتوونیشم هەیە. بەو بڕە، لەوڵاتەکەی خۆم دەبمە کەسێکی دەوڵەمەند.»

کیمیاگەرەکە گوتی، «بەڵام هیچ کام لەوانەت لەهەڕەمەکان دەست نەکەوتووە.»

«هەروەها فاتیمەشم هەیە. ئەو لەهەموو سامانێکی دیکە گرنگترە، کە خاوەنی بم.»

«ئەویشت لەهەڕەمەکان نەدۆزیوەتەوە.»

بەبێ دەنگی نانیان خوارد. کیمیاگەرەکە بتڵێکی کردەوە و شلەیەکی سووری ڕشتە ناو پەرداغی کوڕەکەوە. خۆشترین شەراب بوو، کە هەتا ئێستا کوڕەکە تامی کردبێ.

کوڕەکە پرسی، «ئایا لێرە شەراب حەرام نییە؟»

کیمیاگەرەکە گوتی، «ئەو شتە خراپ نییە، کە دەچێتە دەمی مرۆڤەکانەوە. ئەوە خراپە، کە لەدەمیان دێتە دەرێ.»

کیمیاگەرەکە کەمێک بێزوورە بوو، بەڵام هەر کە کوڕەکە شەرابەکەی خواردەوە، حەوایەوە. لەپاش نانخواردن، لەدەرەوەی چادرەکە دانیشت، لەژێر هەیڤەکەدا، کە هێندە ڕووناک بوو، ئەستێرەکانی زەرد هەڵگەڕاندبوو.

کیمیاگەرەکە تێبینیکرد کوڕەکە دڵخۆشترە، گوتی، «بخۆرەوە و ڕابوێرە. ئەمشەو بەجۆرێک پشوو بدە، وابزانە جەنگاوەریت و خۆت بۆ جەنگ ئامادە دەکەیت. ئەوەت لەیاد بێ، دڵت لەهەرشوێنێک بێ، لەوێ سامانەکەت دەدۆزیتەوە. دەبێ سامانەکە بدۆزیتەوە، تا هەموو ئەو شتانەی لەڕێگەکەتدا فێریان بووی مانایەک ببەخشن.

«سبەی وشترەکە بفرۆشە و ئەسپێک بکڕە. وشتر ناپاکە: هەزاران هەنگاو دەنێ و هەر دەڵێی ماندووش نابێ. بەڵام لەناکاو چۆک دادەدا و دەمرێ. بەڵام ئەسپ وردە وردە هیلاک دەبێ. هەمیشە دەزانی چەندەیان لێداوابکەیت و دەشزانی کەی دەمرن.»



شەوی دواتر، کوڕەکە بەئەسپێکەوە ڕۆیشت بۆ بەردەمی چادری کیمیاگەرەکە. کیمیاگەرەکە ئامادەبوو، سواری زینی ئەسپەکەبوو و بازەکەی خستە سەر شانی چەپی. بەکوڕەکەی گوت، «پیشانم بدە لەکوێی بیابانەکەدا ژیان هەیە. تەنیا ئەوانەی ئەو جۆرە هێمایانە دەبینن دەتوانن سامانەکانیان بدۆزنەوە.»

لەسەر لمەکە دەستیان بەغاردان کرد و ڕووناکی هەیڤەکە ڕێگەی بۆ ڕووناک کردبوونەوە. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، نازانم ئەتوانم ژیان لەبیابانەکەدا بدۆزمەوە یان نا. هێشتا بەباشی شارەزای بیابانەکە نەبووبوو.







دەیویست ئەوە بەکیمیاگەرەکە بڵێ، بەڵام لەو پیاوە دەترسا. گەیشتنە ئەو شوێنە بەردەڵانەی کوڕەکە هەڵۆکانی لێبینیبوو، بەڵام هێشتا تەنیا بێدەنگبوو و دەنگی باکە دەهات.

کوڕەکە گوتی، «نازانم چۆن لەبیابانەکەدا ژیان بدۆزمەوە. دەزانم ژیانی تێدایە، بەڵام نازانم کوێی بۆ بگەڕێم.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «ژیان ژیان ڕادەکێشێ.»

ئەوجا کوڕەکە تێگەیشت. جڵەوی ئەسپەکەی شلکرد و ئەسپەکە بەناو بەردەڵانەکەدا بەرەو پێشەوە غاری دەدا. ئەسپی کوڕەکە بۆ ماوەی نیو کاتژمێر ڕایکرد و کیمیاگەرەکەش بەدوویدا ڕۆیشت. ئیدی نەیاندەتوانی دارخورماکانی مێرگەکە ببینن — تەنیا هەیڤەکەی سەر سەریان و ڕەنگدانەوە تیشکەکانی لەبەردەکاندا دەبیندران. لەناکاو، بەبێ هیچ هۆکارێکی تایبەت، ئەسپی کوڕەکە خاوبووەوە.

کوڕەکە بەکیمیاگەرەکەی گوت، «لێرەدا ژیان هەیە. من زمانی بیابانەکە نازانم، بەڵام ئەسپەکەم زمانی ژیان دەزانێ.»

لە ئەسپەکانیان دابەزین و کیمیاگەرەکەش هیچی نەگوت. بەهێواشی بەرەو پێش ڕۆیشت و ناو بەردەکان دەگەڕا. لەپڕ کیمیاگەرەکە وەستا و خۆی بۆ زەوییەکە چەماندەوە. کونێک لەناو بەردەکاندا هەبوو. کیمیاگەرەکە دەستی بەکونەکەدا کرد، پاشان قۆڵی و تا شانیشی بردە ناوەوە. شتێک لەوێدا دەجووڵایەوە و چاوی کیمیاگەرەکەش — کوڕەکە تەنیا چاوەکانی دەبینی — لەگەڵ خەریکبوونیدا خێل بووبوو. وادیاربوو دەستی لەگەڵ ئەو شتەی ناو کونەکەدا بجەنگێ. پاشان بەجووڵەیەک، کە کوڕەکەی ترساند، باسکی ڕاکێشا و خۆی هەڵدایە سەر پێکانی. مارێکی بەکلک گرتبوو. کوڕەکەش بازی دا، بەڵام خۆی لەکیمیاگەرەکە دوورخستەوە. مارەکە شێتگیرانە دەجەنگا، فیشکەی دەهات و بێدەنگی بیابانەکەی







دەشکاند. مارێکی کۆبرا بوو، کە دەشێ ژەهرەکەی لەچەند خولەکێکدا مرۆڤ بکوژێ.

کوڕەکە گوتی، «ئاگات لەژەهرەکەی بێ.» بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کیمیاگەرەکە پێشتر دەستی بەکونەکەدا کردبوو، بەدڵنیاییشەوە گەسترابوو، بەڵام ڕووخساری هێمن دیاربوو. پیاوە ئینگلیزەکە پێی گوتبوو، «کیمیاگەرەکە تەمەنی دوو سەد ساڵە.» ئەڵبەتە دەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ مارەکانی بیابانەکە بکات.

کوڕەکە بینی هاوەڵەکەی ڕۆیشت بۆلای ئەسپەکەی و شمشێرێکی دەرهێنا. بەنووکی شمشێرەکەی بازنەیەکی لەسەر لمەکە دروستکرد و مارەکەی خستە ناوی. لەناکاو مارەکە حەوایەوە.

کیمیاگەرەکە گوتی، «نیگەران مەبە، بازنەکە بەجێ ناهێڵێ. تۆ ژیانت لەبیابانەکەدا دۆزییەوە، ئەوەش ئەو پێشهاتەیە، کە من پێویستم بوو.»

«بۆچی هێندە گرنگبوو بەلاتەوە؟»

«چونکە هەرەمەکان بەبیابان دەورە دراون.»

کوڕەکە نەیدەویست باسی هەرەمەکان بکات. دڵی قورس بووبوو و لەشەوی پێشووەوە تووشی دڵتەنگی هاتبوو. بەردەوامبوون لەسەر گەڕان بەدووی سامانەکەیدا، مانای بەجێ هێشتنی فاتیمە بوو.

کیمیاگەر گوتی، «لە بیابانەکەدا ڕابەریت دەکەم.»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «دەمەوێ لەمێرگەکە بمێنمەوە. فاتیمەم دۆزیوەتەوە، هەتا ئەویشم هەبێ، زۆر لەسامان گرنگترە.»

کیمیاگەرەکە گوتی، «فاتیمە ژنێکی بیابانشینە. ئەو دەزانێ پیاوان دەڕۆن و دەگەڕێنەوە. ئەو تازە سامانی خۆی دۆزیوەتەوە: تۆ سامانی ئەویت. ئەو دەیەوێ ئەو شتە بدۆزێتەوە، کە بەدوویدا دەگەڕێی.»

«ئەی چی دەبێ گەر بڕیاری مانەوە بدەم؟»

«لێگەڕێ پێت بڵێم چی ڕوودەدات. دەبێتە ڕاوێژکاری مێرگەکە. ئێستا ئاڵتوونی تەواوت هەیە بۆ کڕینی چەند مەڕ و وشترێک. لەگەڵ فاتیمە هاوسەرگیری دەکەیت و بۆ ساڵێک دڵخۆش دەبن. فێردەبیت بیابانەکەت خۆش بوێ و یەک بەیەکی پەنجاهەزار دارخورماکە دەناسیت. تەماشای گەورەبوونیان دەکەیت و دەبینی چۆن هەمیشە جیهان دەگۆڕێ. زیاتر و زیاتر لەپێشهاتەکان تێدەگەیت، چونکە بیابانەکە باشترین مامۆستایە.

«لە ساڵی دووەمدا هەندێکجار بیر لەبیابانەکە دەکەیتەوە. پێشهاتەکان زیاتر باسی دەکەن و تۆش هەوڵ دەدەیت پشتگوێیان بخەیت. زانیاری خۆت بۆ چاودێریکردنی مێرگەکە و دانیشتوانەکەی تەرخان دەکەیت. سەرۆک هۆزەکان نرخی ئەوە دەزانن، کە ئەنجامی دەدەیت. وشترەکانیش سامان و دەسەڵاتت پێدەبەخشن.

«ساڵی سێیەمیش پێشهاتەکان باسی سامانەکە و چارەنووست دەکەن. شەو لەدوای شەو بەمێرگەکەدا دێیت و دەچی، فاتیمەش غەمبار دەبێ، چونکە پێی وادەبێ ئەو بووەتە هۆی وەستانت لەگەڕان بەدووی چارەنووستدا. بەڵام خۆشت دەوێت و ئەویش تۆی خۆشدەوێ. بیرت دەکەوێتەوە، کە هەرگیز ئەو هەوڵی نەداوە بتوەستێنێ، چونکە ژنانی بیابان دەزانن دەبێ چاوەڕێی گەڕانەوەی پیاوەکانیان بکەن. لەبەر ئەوە سەرزەنشتی ناکەیت. بەڵام زۆر جاران بەلمی بیابانەکەدا پیاسە دەکەیت و بیر لەوە دەکەیتەوە، کە دەتوانی بڕۆیت ... دەبوو زیاتر باوەڕ بەخۆشەویستی خۆت بکەیت بەرامبەر فاتیمە. چونکە ئەوەی تۆی لەمێرگەکە هێشتووەتەوە، ترسی ئەوەبووە، کە ڕەنگە هەرگیز نەگەڕێیتەوە. لەو خاڵەشدا، پێشهاتەکان پێت دەڵێن سامانەکەت بۆ هەتا هەتایە لەدەست چووە.

«ئەوجا لەساڵی چوارەمدا، هەندێکجار پێشهاتەکان بەجێت دەهێڵن، چونکە گوێت لێیان نەگرتووە. سەرۆک هۆزەکان ئەوەیان بۆ دەردەکەوێ و بەو شێوەیەش، شوێنەکەی خۆت وەک ڕاوێژکار لەدەست دەدەی. بەڵام دەبیتە بازرگانێکی دەوڵەمەند و چەندین مەڕ و کەلوپەلت دەبێ. باقی ژیانت بەوەوە بەسەردەبەی، کە دەزانی دوای چارەنووسی خۆت نەکەوتوویت و ئەو کاتەش زۆر درەنگ دەبێ.

«دەبێ بزانی خۆشەویستی هەرگیز ڕێگەی ڕۆیشتن بەدووی چارەنووسدا لەمرۆڤ ناگرێ. ئەگەر لەو شوێنکەوتنە بووەستی، لەبەر ئەوەیە خۆشەویستییەکە ڕاستەقینە نییە ... ئەو خۆشەیستییەی بەزمانی جیهان دەدوێ.»

کیمیاگەرەکە بازنەی سەر لمەکەی سڕییەوە و مارەکەش خۆی بەناو بەردەکاندا خشاند. کوڕەکە بیری کریستاڵفرۆشەکەی کەوتەوە، کە هەمیشە دەیویست بچێ بۆ مەککە و بیری پیاوە ئینگلیزەکەی کەوتەوە، کە بەدووی کیمیاگەرەکەدا دەگەڕا. بیری ئەو ژنەی کەوتەوە، کە بڕوای بەبیابانەکە هەبوو. هەروەها تەماشای ئەو بیابانەی کرد، کە بەرەو ئەو ژنەی هێنابوو، کە خۆشیدەویست.

سواری ئەسپەکانیان بوونەوە، ئەمجارە کوڕەکە دوای کیمیاگەرەکە کەوت، کە بەرەو مێرگەکە ڕێگەیان گرتبووە بەر. باکە دەنگی مێرگەکەی بۆ دەهێنان و کوڕەکەش دەیویست گوێی لەدەنگی فاتیمە بێ.

بەڵام ئەو شەوە، کاتێ تەماشای کۆبراکەی ناو بازنەکەی دەکرد، ئەو ئەسپسوارە سەیرەی بازەکەی بەسەر شانەوە بوو، باسی عەشق و سامان، کچی بیابانەکە و چارەنووسی بۆ کرد.

کوڕەکە گوتی، «لەگەڵت دێم.» هەر پاش ئەو قسەیەش هەستی ئاشتەوایی و ئارامی کرد.







«سبەی بەر لەخۆرهەڵاتن بەڕێ دەکەوین،» تاکە وەڵامی کیمیاگەرەکە بوو.



کوڕەکە شەوێکی بێخەوی بەسەربرد. دوو کاتژمێر بەر لەشەبەق، یەکێک لەو کوڕانەی خەبەرکردەوە، کە لەچادرەکە لەگەڵی خەوتبوون و داوای لێکرد شوێنی ژیانی فاتیمەی پیشان بدات. ڕۆیشتن بۆ خێمەکەی و کوڕەکەش بەشی کڕینی مەڕێک ئاڵتوونی بەهاوڕێکەی بەخشی.

ئەوجا داوای لێکرد بچێتە ناو خێمەکە، فاتیمە خەبەر بکاتەوە و پێی بڵێ لەدەرەوە چاوەڕوانی دەکات. لاوە عەرەبەکە کارەکەی جێبەجێکرد و بەشی کڕینی مەڕێکی تریش ئاڵتوونی وەرگرت.

کوڕەکە بەعەرەبە لاوەکەی گوت، «ئێستا بەتەنیا بەجێمان بێڵە.» عەرەبەکە گەڕایەوە بۆ چادرەکەی، شانازیدەکرد کە یارمەتی ڕاوێژکاری مێرگەکەی دابوو، دڵخۆشبوو بەوەی پارەی بەشی کڕینی چەند مەڕێک وەرگرتبوو.

فاتیمە لەدەروازەی چادرەکەوە دەرکەوت. پێکەوە پیاسەیان بەناو دارخورماکاندا دەکرد. کوڕەکە دەیزانی ئەوەیان سەرپێچیکردنە لەنەریتەکاندا، بەڵام بەلایەوە گرنگ نەبوو.

گوتی، «ئێرە بەجێ دەهێڵم، دەشمەوێ بزانی دەگەڕێمەوە. خۆشمدەوێی چونکە ...»

فاتیمە نەیهێشت تەواوی بکات، «هیچ مەڵێ. کەسێک کەسێکی تری خۆشدەوێ، لەبەر ئەوەی خۆشی دەوێ. هیچ هۆکارێ بۆ خۆشویستن پێویست نییە.»







بەڵام کوڕەکە بەردەوام بوو، «خەونێکم بینی و چاوم بەپاشایەک کەوت. کریستاڵم فرۆشت و بیابانەکەم بڕی. لەبەر جەنگی هۆزەکانیش ڕۆیشتم بۆلای بیرێک تا کیمیاگەرەکە بدۆزمەوە. لەبەر ئەوە خۆشمدەوێیت، چونکە تەواوی گەردوون لەدۆزینەوەی تۆدا هاوکاریکردم.»

باوەشیان پێکدا کرد. ئەوە یەکەمجاریانبوو بەر یەکتری بکەون.

کوڕەکە گوتی، «دەگەڕێمەوە.»

فاتیمە گوتی، «بەر لەئێستا، هەمیشە بەچاوەڕوانییەوە تەماشای بیابانەکەم دەکرد، بەڵام لەئێستاوە بەهیواوە سەیری دەکەم. ڕۆژێک باوکم دوورکەوتەوە، بەڵام دواتر گەڕایەوە بۆلای دایکم، ئیدی لەو کاتەوە هەمیشە گەڕاوەتەوە.»

بینی چاوەکانی فاتیمە پڕبوون لەفرمێسک.

«دەگریت؟»

ڕووی وەرگێڕا و گوتی، «من ئافرەتێکی بیابانیم. بەڵام لەسەروو هەموو شتەکانەوە، من ئافرەتم.»

فاتیمە ڕۆیشتەوە بۆ چادرەکەی، کاتێکیش ڕووناکی خۆر دەرکەوت، هاتە دەرێ بۆ کردنی کاری ڕۆژانەی، کە ماوەی چەندین ساڵبوو هەمان کاری ئەنجام دەدا. بەڵام هەموو شتەکان گۆڕابوون. ئیدی کوڕەکە لەمێرگەکە نەبوو، هەرگیز مێرگەکەش ئەو مانایەی نەبوو، کە دوێنێ دەیبەخشی. ئیدی ئەو شوێنە نەبوو، کە پەنجاهەزار دارخورما و سێسەد بیری ئاوی لێبوو، ئەو شوێنە نەبوو، کە ئیدی حاجییەکان لەکۆتایی گەشتەکەیاندا دەیگەیشتنێ و لێی دەحەوانەوە. لەو ڕۆژە بەدواوە، مێرگەکە بۆ ئەو دەبووە شوێنێکی چۆڵ.

لەو ڕۆژە بەدواوە، بیابانەکە گرنگ دەبوو. هەموو ڕۆژێ تەماشایدەکرد و هەوڵیدەدا بیقەبڵێنێ کوڕەکە بۆ دۆزینەوەی

سامانەکەی، بەدووی کام ئەستێرە کەوتووە. دەبوو ماچەکان بەبایەکدا بنێرێ، ئاواتیشی دەخواست بایەکە بەر دەموچاوی کوڕەکە بکەوێ و پێی بڵێ فاتیمە زیندووە. پێی بڵێ چاوەڕێی دەکات، چاوەڕێی پیاوێکی ئازا، کە بەدووی دۆزینەوەی سامانەکەیدا ڕۆیشتووە. ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، بیابانەکە تەنیا یەک شتی لەخۆ گرتبوو بۆ فاتیمە: هیوای گەڕانەوە.



کاتێ بەناو لمی بیابانەکەدا دەستیان بەغاردان کرد، کیمیاگەرەکە بەکوڕەکەی گوت، «بیر لەوە مەکەرەوە، کە بەجێت هێشتووە. هەموو شتێ لەڕۆحی جیهاندا نووسراوە و بۆ هەتاهەتاشە لەوێدا دەمێنێتەوە.»

کوڕەکە گوتی، «مرۆڤ زیاتر خەون بەوەوە دەبینێ بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان، وەک لەوەی بەجێی بێڵێ.» بەبێدەنگی بیابانەکە ڕاهاتبووەوە.

«ئەگەر ئەوەی مرۆڤ دەیدۆزێتەوە، لەماددەی بێخەوش پێک هاتبێ، هەرگیز هیچی لێنایەت. هەمیشەش مرۆڤ دەتوانێ بگەڕێتەوە. ئەگەر ئەوەی دۆزیوتەتەوە تەنیا ساتێک ڕووناکی بێ، هەر بەشێوەی کشانی ئەستێرەیەک، ئەوا لەگەڕانەوەتدا هیچ نادۆزیتەوە.»

ئەو پیاوە بەزمانی کیمیا قسەیدەکرد. بەڵام کوڕەکە دەیزانی مەبەستی لەفاتیمەیە.

زەحمەتبوو بیر لەوە نەکاتەوە، کە بەجێی هێشتبوو. بیابانەکە، بە جاڕسیە بێکۆتاییەکەیەوە، ئەوی دەخستە خەون بینینەوە. کوڕەکە هێشتا دارخورماکان، بیرەکان و دەموچاوی ئەو ئافرەتەی







دەبینی، کە خۆشیدەویست. هێشتا پیاوە ئینگلیزەکەی لەکاتی تاقیکردنەوە زانستییەکانیدا دەبینی و ئەو وشترسوارەی دەبینی، کە بەبێ ئەوەی خۆی پێبزانێ، مامۆستا بوو. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ڕەنگە هەرگیز کیمیاگەرەکە عاشق نەبووبێ.

کیمیاگەرەکە لەپێشەوە سواریی دەکرد و بازەکەی بەسەر شانەوە بوو. باڵندەکە بەباشی زمانی بیابانەکەی دەزانی، هەر کاتێکیش وەستان، دەچوو ڕاویدەکرد. یەکەم ڕۆژ بەکەروێشکێک و دووەم ڕۆژیش بەدوو باڵندەوە گەڕایەوە.

لە شەودا لەدووری یەک دەخەوتن و ئاگرەکانیان دەشاردەوە. شەوانی بیابان سارد بوو، لەگەڵ تێپەڕینی قۆناغەکانی هەیڤیشدا، تاریکتر و تاریکتر دەبوو. هەفتەیەک ڕۆیشتن و تەنیا قسەیان دەربارەی وریابوونی خۆیانەوە دەکرد، تا خۆیان لەجەنگی نێوان هۆزەکان بپارێزن. جەنگەکە بەردەوامبوو و هەندێک جاریش بایەکە بۆنی ناخۆشی خوێنی دەهێنا. لەو نزیکانە جەنگ هەڵگیرسابوو، ئەمەش بەبیری کوڕەکەی دەخستەوە، کە زمانی پێشهات بوونی هەیە، هەمیشە ئامادەبوو ئەو شتانە پیشانی کوڕەکە بدات، کە چاوەکانی نەیاندەتوانی بیبینن.

لە حەوتەم ڕۆژدا، کیمیاگەرەکە بڕیاریدا لەکاتی ئاسایی خۆیان زووتر بووەستن. بازەکەی بۆ ڕاوکردن نارد و کیمیاگەرەکەش قاپێک ئاوی بۆ کوڕەکە ڕاگرت.

کیمیاگەرەکە گوتی، «خەریکە دەگەیتە کۆتایی گەشتەکەت. پیرۆزبایی بەدووکەوتنی چارەنووسی خۆتت لێدەکەم.»

کوڕەکە گوتی، «تۆیش لەڕێگە هیچ شتێکت پێنەگوتم. پێم وابوو هەندێک لەو شتانەم فێربکەی، کە خۆت دەیانزانی. ماوەیەک لەمەوبەر، لەگەڵ پیاوێک بەبیابانەکەدا گەشتمکرد، کە کۆمەڵێک

کتێبی کیمیایی پێبوو. بەڵام نەمتوانی هیچیان لێوە فێرببم.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «تەنیا یەک ڕێگە هەیە بۆ فێربوون، ئەویش لەڕێگەی کردارەوەیە. هەموو ئەو شتانەی پێویستە بیانزانی، لەگەشتەکانتەوە فێریان بووی. تەنیا پێویستە یەک شتی دیکە فێرببی.»

کوڕەکە دەیویست بزانێ ئەو شتە چییە، بەڵام کیمیاگەرەکە لە ئاسۆ بۆ بازەکە دەگەڕا.

«بۆچی پێت دەگوترێ کیمیاگەر؟»

«چونکە کیمیاگەرم.»

«ئەی چی بەسەر ئەو کیمیاگەرانەدا هات، کە ویستیان ئاڵتوون دروست بکەن و نەیانتوانی؟»

هاوەڵەکەی لەوەڵامدا گوتی، «ئەوان تەنیا بۆ ئاڵتوون دەگەڕان. ئەوان بۆ سامانی چارەنووسیان دەگەڕان، بەبێ ئەوەی بیانەوێ لەناو چارەنووسی خۆیاندا ژیانیان بگوزەرێنن.»

کوڕەکە پرسی، «ئەو شتە چییە، کە دەبێ بیزانم؟»

بەڵام کیمیاگەرەکە لەسەر تەماشاکردنی ئاسۆ بەردەوام بوو. لەکۆتاییشدا بازەکە بەژەمە خۆراکێکەوە گەڕایەوە. چاڵێکیان هەڵکەند و ئاگریان تێدا کردەوە، تا گڕەکانی نەبیندرێ.

خواردنەکەی ئامادەکرد و گوتی، «من کیمیاگەرم، زۆر بەسادەیی لەبەر ئەوەی کیمیاگەرم. ئەو زانستە لەباوە گەورەمەوە فێربووم، ئەویش لەباوکییەوە فێری بووبوو، بەو شێوەیەش دەڕوات و هەر لەسەرەتای دروستبوونی جیهانەوە بۆمان ماوەتەوە. لەو دەمەدا، دەکرا کاری ناوازە بەسادەیی لەسەر زمروتێک بنووسرێ. بەڵام خەڵکی دەستیان بەڕەتکردنەوەی شتی ئاسان کرد و دەستیان بەنووسینی کورتە وتار و لێکدانەوە و خوێندنی فەلسەفە کرد.







پێیان وابوو رێگەیەکی باشتر لەخەڵکانی دیکە شک دەبەن. بەڵام هێشتا و تا ئەمرۆش تابلۆی زمروتەکە هەر ماوە.»

«چی لەسەر تابلۆی زمروتەکە نووسراوە؟» کورەکە دەیویست بزانێ.

کیمیاگەرەکە دەستیکرد بەوێنەکێشان لەسەر لمەکە، لەماوەی کەمتر لەپێنج خولەکدا تەواوبوو. کاتێ وێنەکەی دەکێشا، کورەکە بیری لەپاشا پیرەکە و ئەو گۆرەپانە دەکردەوە، کە ئەو رۆژە یەکتریان لێبینیبوو؛ هەر دەتگوت سالانێکی زۆری بەسەردا تێپەریووە.

کاتێ تەواوبوو، کیمیاگەرەکە گوتی، «ئەمە لەسەر تابلۆی زمروتەکە نووسراوە.»

کورەکە هەولیدا نووسراوی سەر لمەکە بخوێنێتەوە.

پاشان بەکەمێک هیوابراوییەوە گوتی، «ئەوە کۆدە. هەر لەوانە دەچێ، کە لەکتێبەکانی پیاوە ئینگلیزەکەدا بینیم.»

کیمیاگەرەکە لەوەلامدا گوتی، «نەخێر، لەفرینی هەلۆکان دەچێ؛ ناتوانی تەنیا بەبۆنەی هۆکارەوە لێیان تێبگەیت. تابلۆ زمروتییەکە رارەوێکی راستەوخۆیە بەرەو ناو رۆحی جیهان.

«زاناکان تێگەیشتوون ئەم جیهانە سروشتییە تەنیا وێنە و کۆپییەکی بەهەشتە. بوونی ئەم جیهانە تەنیا دلنیاییەکە بۆ هەبوونی جیهانێکی بێخەوش. خودا ئەم جیهانەی دروستکردووە، تا مرۆڤ لەرێگەی شتە بەرجەستەکانیەوە لەفێرکارییە رۆحانییەکان و زانستە سەرسورهێنەرەکەی تێبگات. مەبەستم لەوەبوو، کە گوتم بەکردار.»

کورەکە پرسی، «پێویستدەکات لەتابلۆ زمروتییەکە تێبگەم؟»

«رەنگە، گەر لەتاقیگەیەکی کیمیاییدا بایت، باشترین کات دەبوو بۆ تێگەیشتن لەتابلۆ زمروتییەکە. بەلام ئێستا لەبیاباندایت. لەبەر







ئەوە تەنیا سەرقاڵی کاری خۆت بە. بیابانەکە وات لێدەکا لەجیهان تێبگەی؛ لەڕاستیدا هەموو شتێکی سەر ڕووکاری زەوی هەمان ئەو کارە دەکات. تەنانەت پێویست ناکا لەبیابانەکەش تێبگەی: هەموو ئەوەی پێویستە بیکەی، تێڕامانە لەدەنکە لمێک، بەو شێوەیەش هەموو شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئافراندن دەبینی.»

«چۆن دەتوانم لەبیابانەکەدا نوقووم ببم؟»

«گوێ لەدڵت بگرە. ئەو هەموو شتەکان دەزانێ، لەڕۆحی جیهانەوە هاتووە و ڕۆژێکیش دێ بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە.»



دوو ڕۆژی تر بەبێدەنگی بەبیابانەکەدا ڕۆیشتن. کیمیاگەرەکە زیاتر وریابوو، چونکە لەشوێنێک نزیک دەبوونەوە، کە سەختترین جەنگی تێدا هەڵگیرسابوو. کاتێ دەڕۆیشتن، کوڕەکە هەوڵیدا گوێ بۆ دڵی بگرێ.

کارێکی ئاسان نەبوو؛ پێشتر هەمیشە دڵی ئامادەبوو چیرۆکی خۆی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام بەو دواییانە وانەبوو. سەردەمێکبوو بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک باسی غەمباری خۆی دەکرد، جارەکانی تریش سۆزی بۆ خۆرهەڵاتنی بیابانەکە دەجووڵا و بەو شێوەیەش، کوڕەکە ناچار دەبوو فرمێسکەکانی بشارێتەوە. دڵی خێراتر لێیدەدا کاتێ باسی سامانی بۆیدەکرد، خاویش دەبووەوە کاتێ چاوی لەئاسۆی بێکۆتای بیابانەکە دەبڕی. بەڵام هەرگیز دڵی بێدەنگ نەدەبوو، تەنانەت ئەو کاتانەش، کە کوڕەکە و کیمیاگەرەکە بێدەنگ دەبوون.

لەو ڕۆژەدا، کاتێ بۆ پشوودان وەستان، کوڕەکە پرسی، «بۆچی

دەبێ گوێ لەدڵمان بگرین؟»

«چونکە دڵت لەهەر شوێنێ بێ، لەوێ سامانەکەت دەدۆزیتەوە.»

کوڕەکە گوتی، «بەڵام دڵم ورووژاوە. خەونی خۆی هەیە، سۆزدارە و عاشقی کچێکی بیاباننشینە. کاتێ بیر لەو کچە دەکەمەوە، دڵم داوای شتم لێدەکا و چەندین شەو بێ خەوم دەکات.»

«کەواتە زۆر باشە. دڵت زیندووە. بەردەوام گوێی لێبگرە.»

لە سێ ڕۆژی دواتردا، دوو گەشتیارەکە بەلای کۆمەڵێک چەکداری هۆزنشیندا تێپەڕین و کۆمەڵێکی دیکەشیان لەئاسۆوە بینی. دڵی کوڕەکە دەستیکرد بەباسکردنی ترس. ئەو چیرۆکانەی بۆ دەگێڕایەوە، کە لەڕۆحی جیهانەوە بیستبوونی، چیرۆکگەلێک لەبارەی ئەو مرۆڤانەوە، کە بەدووی سامانەکەیاندا ڕۆیشتوون و هەرگیز نەیاندۆزیوەتەوە. هەندێکجار بەو بیرۆکەیە کوڕەکەی دەترساند، کە ڕەنگە سامانەکەی نەدۆزێتەوە، یان لەوانەیە لەبیابانەکەدا بمرێ. هەندێک جاری تریش قایلبوونی خۆی بۆ کوڕەکە دەردەبڕی: بەدۆزینەوەی عەشق دەوڵەمەند بووبوو.

کاتێ ڕاوەستان تا پشوو بەئەسپەکان بدەن، کوڕەکە بەکیمیاگەرەکەی گوت، «دڵم خاینە. نایەوێ بەردەوام بم.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «جێی خۆیەتی. سروشتییانە لەوە دەترسێ لەبەدووکەوتنی خەونەکەتدا ئەوەی هەتە لەدەستی بدەیت.»

«ئەی کەواتە بۆچی دەبێ گوێ لەدڵم بگرم؟»

«چونکە جارێکی تر ناتوانی بێدەنگی بکەیت. گەر تەنانەت وایش خۆت دەربخەیت، کە گوێی لێ ناگری، هەمیشە هەر لەناو تۆدا دەبێ، ئەوە دووبارە دەکاتەوە، کە لەبارەی ژیان و جیهانەوە بیری لێدەکەیتەوە.»







«مەبەستت ئەوەیە گەر تەنانەت ناپاکیشبوو هەر دەبێ گوێی لێبگرم؟»

«ناپاکی شتێکە و کتوپڕ دێت. ئەگەر بەباشی دڵت بناسی، هەرگیز ناتوانێ خیانەتت لێبکات. چونکە خەون و ئارەزووەکانی دەزانیت و دەزانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت.

«هەرگیز ناتوانی لەدڵت هەڵبێی. لەبەر ئەوە واباشترە گوێی لێبگریت. بەو شێوەیەش پێویست ناکا هەرگیز لەپیاکێشانێکی لەناکاو بترسی.»

لەگەڵ تێپەڕینیان بەبیابانەکەدا، کوڕەکە لەسەر گوێگرتن لەدڵی بەردەوام بوو. لەفێڵەکانی تێگەیشت و وەک خۆی قبوولیکرد. ترسی نەما و پێویستی گەڕانەوەی بۆ مێرگەکە لەیادکرد، چونکە ئێوارەیەکیان پێی گوت شادمانە. دڵی گوتی، «گەر چی هەندێکجار گلەیی دەکەم، لەبەر ئەوەیە من دڵی مرۆڤم، دڵی مرۆڤیش بەو شێوەیەیە. خەڵکی لەبەدووکەوتنی گرنگترین خەونەکانیان دەترسن، چونکە هەست دەکەن شایانی ئەوە نین، یان ناتوانن پێیان بگەن. ئێمەی دڵ، تەنیا بەبیرکردنەوە لەو خەڵکانەی بۆ هەمیشە دەڕۆن، دەترسین یان بەو ساتانەی دەکرا باش بن و نەبوون، یان ئەو سامانەی دەکرا بدۆزرابایەتەوە، بەڵام بۆ هەتاهەتایە لەناو دەنکە لمەکاندا نێژرا. چونکە کاتێ ئەو شتانە ڕوودەدەن، خراپ ئازار دەچێژین.»

شەوێک کە تەماشای ئاسمانە بێ هەیڤەکەیان دەکرد، کوڕەکە بەکیمیاگەرەکەی گوت، «دڵم لەئازارچەشتن دەترسێ.»

«بە دڵت بڵێ ترسی ئازارچەشتن لەخودی ئازارچەشتن خراپترە. هەرگیز هیچ دڵێکیش بەگەڕان بەدووی خەونەکانیدا ئازار ناچێژێ، چونکە هەر چرکەیەکی گەڕانەکە، چرکەیەکی ڕێکەوتکردنی خودا و







ئەبەدیەتـە.»

کوڕەکـە بەدڵـی گـوت، «هەمـوو چرکەیەکـی گـەڕان، ڕێکەوتکردنـی خودایــە. کاتــێ بەڕاسـتی بـەدووی سـامانەکەمدا دەگەڕێـم، هەمـوو ڕۆژێکـم درەوشـاوەیە، چونکـە دەزانـم کاتـێ سـامانەکە دەدۆزمـەوە، هەمـوو کاتژمێرێـک دەبێـت بەبەشـێک لـەو. کاتـێ بەڕاسـتی بـەدووی سـامانەکەمدا گـەڕاوم، شـتگەلێکم دۆزیوەتـەوە، کـە هەرگیـز نەمبینیـون و نەمویـراوە بیانکـەم، چونکـە پێـم وابـووە ئـەو شـتانە بـۆ شـوان مەحـاڵ بـن.»

ئەوجـا دڵـی بـۆ تـەواوی پاشـنیوەڕۆیەک بێدەنـگ بـوو. ئـەو شـەوە کوڕەکـە خەوێکـی قووڵـی لێکـەوت، کاتێکیـش خەبـەری بـووەوە، دڵـی شـتگەلێکی پێگـوت، کـە لەڕۆحـی جیهانـەوە هاتبـوون. پێـی گـوت ئـەو کەسـانەی دڵخۆشـن، خودا لەناخیاندایە. وەک کیمیاگەرەکەش گوتبووی، دەکرێ خۆشەویستی لەدەنکە لمێکـی بیابانەکـەدا بدۆزرێتـەوە. چونکـە دەنکـە لـم سـاتێکی ئافراندنـە، گەردوونیـش ملیۆنـان سـاڵی پێچـووە تـا ئافراندوویەتـی. دڵـی گوتـی، «هەمـوو کەسـێکی سـەر زەوی سـامانێک چاوەڕێـی دەکات. ئێمـەی دڵـی مرۆڤیـش بەدەگمـەن شـت لەبـارەی ئـەو سامانانەوە دەڵێیـن، چونکـە ئیـدی خەڵکی نایانـەوێ بەدوویاندا بگەڕێن. ئـەو شـتانە تەنیـا بەمنـداڵان دەڵێیـن. دواتریـش، زۆر بەسـادەیی ڕێگـە بەژیانیـان دەدەیـن بەئاڕاسـتەی خۆیـان و بـەرەو چارەنووسـی خۆیـان تێپـەڕن. بـەڵام بەداخـەوە، کـەم کـەس بـەو ڕاڕەوەدا دەڕوات، کـە بۆیـان دیـاری کـراوە — ڕاڕەوی چارەنـووس و شـادمانی. زۆرینـەی خەڵکـی، جیهـان وەک شـتێکی مەترسـیدار دەبینـن، لەبـەر ئـەوەش جیهـان هەڵدەگەڕێتـەوە و هـەر بەڕاسـتی دەبێتـە شـتێکی مەترسـیدار.

«لەبـەر ئـەوە، ئێمـەی دڵ نیانتـر و نیانتـر قسـە دەکەیـن. هەرگیـز بێدەنـگ نابیـن، بـەڵام ئـاوات دەخوازیـن وشـەکانمان نەبیسـترێ:

نامانـەوێ خەڵکی لەبەر بـەدوو نەکەوتنـی دڵەکانیـان ئـازار بچێـژن.»
کوڕەکـە لەکیمیاگەرەکـەی پرسـی، «بۆچـی دڵـەکان بەخەڵکی ناڵێن لەبەشوێن کەوتنـی خەونەکانیـان بـەردەوام بن؟»
«چونکە ئـەوە لەهەمـوو شتێکی دیکـە زیاتـر ئـازاری دڵـەکان دەدا، دڵەکانیش نایانـەوێ ئـازار بچێـژن.»
لـەوێ بـەدواوە، کوڕەکـە لەدڵـی تێگەیشـت. تـکای لێکـرد هەرگیز لەقسـەکردن نەوەسـتێ. داوای لێکـرد کاتـێ لەخەونەکانـی دوورکەوتـەوە، دڵـی هاواربـکات و ئـاگاداری بکاتـەوە. کوڕەکـە سـوێندی خـوارد هەر کات گوێـی لەئاگادارکردنەوەکـە بـوو، پەیامەکـەی بەجـێ بێنـێ.
ئـەو شـەوە هەمـوو شتەکانی بەکیمیاگەرەکـە گـوت. کیمیاگەرەکەش تێگەیشـت، کـە دڵـی کوڕەکـە گەڕاوەتـەوە بـۆ ڕۆحـی جیهـان.
کوڕەکە پرسی، «کەواتە ئێستا دەبێ چیبکەم؟»
کیمیاگەرەکـە گوتـی، «بـەرەو هەرەمـەکان بـەردەوام بـە. وریـای پێشـهاتەکانیش بـە. هێشـتا دڵـت توانـای ئـەوەی هەیـە شـوێنی سـامانەکەت پیشـان بـدات.»
«ئایا ئەوە ئەو شتەیە، کە هێشتا دەبێ بیزانم؟»
کیمیاگەرەکـە لەوەڵامـدا گوتـی، «نەخێـر، ئـەوەی پێویستە بیزانـی، ئەمەیـە: بـەر لـەوەی خەونـێ بـەدی بهێنـدرێ، ڕۆحـی جیهان لەهەمـوو ئـەو شتانەدا تاقیتدەکاتـەوە، کـە لەڕێگەکـەدا فێریـان بوویت. ئەمـە لەخراپـی خۆیـدا نـاکات، بەڵکـو دەیـەوێ لەگـەڵ بەدیهێنانـی خەونەکانمـان، بەتەواوەتـی شـارەزای ئـەو وانانـە بیـن، کـە لەڕێگـەی خەونەکانمانـدا فێریـان بوویـن. زۆرینـەی خەڵکـی لـەو خاڵـەدا کۆڵ دەدەن. گـەر بەزمانـی بیابـان بیڵێیـن، ئـەوەش ئـەو خاڵەیـە، کە 'کەسێک بەهـۆی تینوێتییـەوە دەمـرێ، کاتـێ دارخورمـاکان لەئاسـۆوە دەردەکـەون.'



«هەموو گەڕانێک بەبەختی دەستپێکەر دەست پێدەکات. هەموو گەڕانێکیش بەتاقیکردنەوەی تەواوەتی کەسە سەرکەوتووەکە کۆتایی دێت.»

کوڕەکە پەندێکی وڵاتەکەی خۆی بیرکەوتەوە. کە دەڵێ، تاریکترین کاتژمێری شەو، ڕێک بەر لەکازیوەیە.



ڕۆژی دواتر یەکەم نیشانەی ڕوونی مەترسی دەرکەوت. سێ چەکداری هۆزنشین هاتنە پێشێ و لەکوڕەکە و کیمیاگەرەکەیان پرسی لەوێ چی دەکەن.

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «هاتووم ڕاو بەبازەکەم بکەم.»

یەکێک لەپیاوەکان گوتی، «دەبێ بتانپشکنین، تا بزانین چەکتان پێیە.»

کیمیاگەرەکە بەهێواشی لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارێ و کوڕەکەش هەمان شتی کرد.

کاتێ جانتای کوڕەکە دەگەڕا، هۆزنشینەکە گوتی، «بۆچی پارەت لەگەڵ خۆت هەڵگرتووە؟»

گوتی، «پێویستم پێیەتی تا بگەمە هەڕەمەکان.»

ئەو پیاوەی شتەکانی کیمیاگەرەکە دەگەڕا، کەمۆڵەیەکی پڕ لەشلە و شووشەیەکی هێلکەیی زەردی دۆزییەوە، کە کەمێک لەهێلکەی مریشک گەورەتربوو.

پرسی، «ئەمانە چین؟»

«ئەوانە بەردی فەیلەسوف و نەمری ژیانن. ئەوە کاری ناوازەی کیمیاگەرەکانە. هەر کەسێک شلەکە بخواتەوە، هەرگیز جارێکی






تر نەخۆش ناکەوێ، یەک تەڵەزم لەبەردەکەش دەتوانێ هەموو کانزایەک بگۆڕێ بەئاڵتوون.»

عەرەبەکان پێی پێکەنین و کیمیاگەرەکەش لەگەڵیاندا پێکەنی. پێیان وابوو وەڵامەکەی سەرسوڕهێنەر بێ، بۆیە ڕێگەیاندا کوڕەکە و کیمیاگەرەکە شتەکانیان بەرن و بڕۆن.

کاتێ ڕۆیشتن، کوڕەکە لەکیمیاگەرەکەی پرسی، «تۆ شێتی؟ لەپێناو چیدا ئەوەت کرد؟»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «تا وانەیەکی سادەی ژیانت فێربکەم. کاتێ سامانێکی مەزنت پێیە و دەتەوێ بەخەڵکی بڵێی، بەدەگمەن باوەڕت پێدەکرێ.»

بەناو بیابانەکەدا بەردەوام بوون. لەگەڵ تێپەڕینی هەر ڕۆژێکدا، دڵی کوڕەکە بێدەنگتر و بێدەنگتر دەبوو. ئیدی نەیدەویست شت لەبارەی داهاتوو و ڕابردووەوە بزانێ؛ تەنیا بەتەماشاکردنی بیابانەکە ئاسوودە بوو، دەشیویست لەگەڵ ڕۆحی کوڕەکە لەڕۆحی جیهان بخواتەوە. کوڕەکە و دڵی بووبوونە هاوڕێ، ئێستا کەسیان نەیاندەتوانی ناپاکی لەگەڵ ئەوەی تریاندا بکەن.

کاتێ دڵی قسەی بۆ کوڕەکە دەکرد، لەبەر ئەوەبوو هانی کوڕەکە بدات و هێزی پێببەخشێ، چونکە ڕۆژە بێدەنگەکانی ناو بیابانەکە بێزارکەر بوون. دڵی باسی تایبەتمەندییە بەهێزەکانی بۆ کوڕەکە کرد: ئازایەتی کۆڵدان لەمەڕەکان و بەدووکەوتنی چارەنووسی و پەرۆشییەکەی لەکاتی کارکردندا لەدوکانی کریستاڵەکە.

دڵی شتێکی تریشی پێگوت، کە هەرگیز کوڕەکە تێبینی نەکردبوو: باسی ئەو مەترسیانەی بۆ کرد، کە ئەویان ترساندبوو، بەڵام هەرگیز کوڕەکە دەرکی پێنەکردبوو. دڵی پێی گوت، کە گوایا جارێک ئەو تفەنگەی شاردبووەوە، کە کوڕەکە لەباوکی بردبوو،






چونکە لەئەگەری ئەوە ترسابوو، خۆی پێ بریندار بکات. ئەو ڕۆژەی بیری کوڕەکە هێنابووەوە، کە نەخۆش بووبوو و لەناو کێڵگەکاندا ڕشابووەوە، لەپاش ئەوەش بەقوولی خەوی لێکەوتبوو. ئەو ڕۆژە دوو دز لەدوورەوە پلانیان دانابوو مەڕەکانی کوڕەکە بدزن و خۆیشی بکوژن. بەڵام لەبەر ئەوەی کوڕەکە بەرەو پێش نەڕۆیشتبوو، دزەکان ڕۆیشتبوون، چونکە پێیان وابوو کوڕەکە ڕێگەی گۆڕیبێ.

کوڕەکە لەکیمیاگەرەکەی پرسی، «ئایا دڵی مرۆڤ هەمیشە یارمەتی دەدات؟»

«بەزۆری دڵی ئەو کەسانەی دەیانەوێ بەچارەنووسی خۆیان بگەن. بەڵام یارمەتی منداڵ و مەست و بەتەمەنەکانیش دەدەن.»

«مانای ئەوەیە هەرگیز ناکەومە مەترسییەوە؟»

کیمیاگەرەکە گوتی، «مانای وایە ئەوەی دڵ پێی بکرێ، دەیکات.»

پاشنیوەڕۆیەک، بەتەنیشت چادرگەی یەکێک لەهۆزەکاندا تێپەڕین. عەرەبەکان لەهەموو سووچێکی چادرگەکەدا وەستابوون، کە دشداشەی سپی جوانیان لەبەردابوو و چەکەکانیشیان لەسەر پێبوون. پیاوەکان نێرگیلەیان دەکێشا و چیرۆکیان لەبارەی بەرەکانی جەنگەوە دەگێڕایەوە. کەس گوێی بەدوو گەشتیارەکە نەدا.

کاتێ گەیشتنە پشتی چادرگەکە، کوڕەکە گوتی، «هیچ مەترسییەک نییە.»

کیمیاگەرەکە تووڕە دیاربوو: «بڕوا بەدڵت بکە، بەڵام هەرگیز لەیادی مەکە لەناو بیاباندایت. کاتێ مرۆڤەکان بەرامبەر یەکتر دەجەنگێن، ڕۆحی جیهان هاوارەکانی شەڕ دەبیستێ. کەس لەئازارچەشتنی ئەنجامی شتەکانی ژێر خۆر ڕزگاری نابێ.»

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، هەموو شتەکان یەکن. ئەوجا هەر







وەک بڵێی بیابانەکە ویستوویەتی بیسەلمێنێ کیمیاگەرەکە ڕاست دەکات، دوو ئەسپسوار لەپشتی گەشتیارەکانەوە دەرکەوتن.

یەکێکیان گوتی، «ناتوانن لەوە زیاتر بڕۆن. ئێوە لەناوچەی جەنگی هۆزەکاندان.»

کیمیاگەرەکە ڕێک تەماشای ناو چاوەکانی ئەسپسوارەکەی کرد و لەوەڵامدا گوتی، «زۆر دوور ناکەومەوە.» بۆ ساتێک بێدەنگ بوون و ڕازیبوون بەوەی کیمیاگەرەکە و کوڕەکە بەردەوام بن.

کوڕەکە بەسەرسوڕماوی تەماشای ئەو نیگا گۆڕینەوەیەی کرد. گوتی، «بەو شێوە سەیرکردنەت توانیت بەسەر ئەسپسوارەکاندا زاڵ بیت.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «چاوەکانت هێزی ڕۆحت دەردەخەن.»

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ڕاستە. تێبینیکردبوو، کە لەناوەڕاستی کۆمەڵە چەکدارەکەدا یەکێکیان چاوی لەو دووانە بڕیبوو. هێندە دووربوو، کە هەر دەموچاویشی نەدەبیندرا. بەڵام کوڕەکە دڵنیابوو لەوەی تەماشای ئەوانی کردبوو.

لەکۆتاییدا، کاتێ لەو زنجیرە چیایە پەڕینەوە، کە بەتەواوی ئاسۆدا درێژبووبووەوە، کیمیاگەرەکە گوتی تەنیا دوو ڕۆژ لەهەڕەمەکانەوە دوورن.

کوڕەکە گوتی، «ئەگەر بەم نزیکانە جیادەبینەوە، فێری کیمیام بکە.»

«خۆت کیمیا دەزانی. کیمیا چوونە ناو ڕۆحی جیهان و دۆزینەوەی ئەو سامانەیە، کە بۆت داندراوە.»

«نەخێر، مەبەستم ئەوە نییە. باسی گۆڕینی قورقوشم دەکەم بەئاڵتوون.»

کیمیاگەرەکە هەر بەشێوەی بیابانەکە بێدەنگ بوو، تا کاتی





نانخواردنیش وەڵامی کوڕەکەی نەدایەوە.

گوتی، «هەموو شتێ لەگەردووندا گەشەیکردووە. بەلای مرۆڤی زیرەکیشەوە، ئاڵتوون ئەو کانزایەیە، کە باشترین گەشەیکردووە. مەپرسە بۆ؛ منیش نازانم. تەنیا ئەوە دەزانم، کە هەمیشە نەریتەکان ڕاست دەکەن.

«مرۆڤ هەرگیز لەوشەکانی زاناکان تێنەگەیشتووە. بەو شێوەیەش ئاڵتوون، لەجێی ئەوەی ببێتە هێمای گەشەکردن، بووەتە بنچینەی ململانێ.»

کوڕەکە گوتی، «شتەکان بەچەندین زمان قسە دەکەن. کاتێکبوو ناڵەی وشترێک، جگە لەناڵەی وشترێک هیچ شتێکی تر نەبوو. وای لێهات بووە نیشانەی مەترسی. لەکۆتاییشدا تەنیا بووەوە بەناڵەی وشتر.»

بەڵام وەستا. بەدڵنیاییەوە کیمیاگەرەکە خۆی ئەو شتانەی دەزانی.

کیمیاگەرەکە بەردەوامبوو، «کیمیاگەری ڕاستەقینەم ناسیووە. خۆیان لەتاقیگەکانیاندا زیندانیکردووە، تا ئەوانیش بەشێوەی ئاڵتوون گەشە بکەن. ئەوجا بەردی فەیلەسوفیان دۆزیوەتەوە، چونکە تێگەیشتوون لەوەی کاتێ شتێ گەشە دەکات، هەموو شتەکانی چواردەوریشی لەگەڵیدا بەرەو پێش دەچن.

«هەندێکی تریان بەڕێکەوت بەردەکە دەدۆزنەوە. ئەوان خۆیان بەهرەدارن و ڕۆحیشیان لەڕۆحی خەڵکانی تر ئامادەترە. بەڵام ئەوانە حیساب ناکرێن. چونکە زۆر دەگمەنن.

«ئەوانەش هەن، کە تەنیا بایەخ بەئاڵتوون دەدەن. هەرگیز نهێنییەکەیان بۆ نەدۆزراوەتەوە. ئەوان لەیادیانکردووە قورقوشم و مس و ئاسنیش چارەنووسی خۆیانیان هەیە. کاتێکیش کەسێ







دەست دەخاتە چارەنووسی شتێکی دیکەوە، هەرگیز چارەنووسی خۆی بۆ نادۆزرێتەوە.»

وشەکانی کیمیاگەرەکە وەک نەفرینێک دەنگیان دەدایەوە. سەدەفێکی لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوە.

گوتی، «ئەم بیابانە ڕۆژێک لەڕۆژان دەریابووە.»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «تێبینی ئەوەم کردووە.»

کیمیاگەرەکە داوای لەکوڕەکە کرد سەدەفەکە بنێت بەگوێیەوە. لەمنداڵیدا چەندینجار ئەوەی کردووە و گوێی لەدەنگی دەریا بووە.

«دەریاکە لەناو ئەو سەدەفەدا ژیاوە، چونکە ئەوە چارەنووسی خۆی بووە. ئەوەیش هەرگیز کۆتایی پێنایەت، هەتا جارێکی تر بیابانەکە بەئاو دانەپۆشرێتەوە.»

سواری ئەسپەکانیان بوونەوە و ئاڕاستەی هەڕەمەکانی میسرپیان گرتەوە بەر.



خۆر لەئاوابووندابوو کاتێ دڵی کوڕەکە ئاماژەی بەمەترسی کرد. بەگردەبای زەبەلاح دەورە درابوون، کوڕەکەش تەماشای کیمیاگەرەکەی کرد، تا بزانێ هەستی بەهیچ کردووە. بەڵام وادەردەکەوت ئاگای لەهیچ مەترسییەک نەبێ. لەپاش پێنج خولەک، کوڕەکە دوو ئەسپسواری بینی، کە چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد. بەر لەوەی هیچ بەکیمیاگەرەکە بڵێ، دوو ئەسپسوارەکە بوون بە دە و پاشانیش سەد دانە. ئەوجا لەهەموو جێگەیەکی نزیک گردەباکان دەبیندران.

ئەوان پیاوانی هۆزنشین بوون و بەرگی شینیان لەبەردابوو، بازنەی ڕەشیشیان بەدەوری عەگالەکانیانەوە کردبوو. دەموچاویان

بەپەچەی شین داپۆشرابوو و تەنیا چاوەکانیان بەدەرەوەبوو.

تەنانەت لەدووریشەوە چاوەکانیان هێزی ڕۆحیانی دەردەخست.

چاویان باسی مەرگی دەکرد.



هەردووکیان بران بۆ ئۆردوگایەکی سەربازی ئەو نزیکانە. کوڕەکە و کیمیاگەرەکە برانە ئەو چادرەی سەرۆکەکە لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا لەکۆبوونەوەدا بوو.

یەکێکیان گوتی، «ئەمانە سیخوڕەکانن.»

کیمیاگەرەکە گوتی، «ئێمە تەنیا گەشتیارین.»

«سێ ڕۆژ پێش ئێستا لەسەربازگەی دوژمن بیندراون. لەگەڵ یەکێک لەسوارچاکەکانی ئەوێدا قسەتاندەکرد.»

کیمیاگەرەکە گوتی، «من پیاوێکم بەبیابانەکەدا دەسوڕێمەوە و شارەزاییم لەئەستێرەکاندا هەیە. زانیاریم لەسەر سوپا و جوولەی هۆزەکان نییە. زۆر بەسادەیی ڕابەری هاوڕێکەم دەکەم.»

سەرتیپەکە پرسی، «هاوڕێکەت کێیە؟» کیمیاگەرەکە گوتی، «کیمیاگەرە. لەهێزەکانی سروشت تێدەگات. دەشیەوێ هێزە نائاساییەکانیتان نیشان بدات.»

کوڕەکە بەبێدەنگی گوێی دەگرت. ترسابوو.

یەکێکی تر لەپیاوەکان پرسی، «بێگانەیەک لێرە چی دەکات؟»

بەر لەوەی کوڕەکە فریاکەوێ یەک وشە بڵێ، کیمیاگەرەکە گوتی، «پارەی بۆ هۆزەکەتان هێناوە.» کیمیاگەرەکە جانتای کوڕەکەی هەڵگرت و ئاڵتوونەکانی بەخشی بەسەرتیپەکە.

عەرەبەکە بەبێ یەک وشە قبوڵی کرد. بەشی کڕینی کۆمەڵێک

چەکی باشی دەکرد.

لەکۆتاییدا پرسی، «کیمیاگەر چییە؟»

«کەسێکە و لەسروشت و جیهان تێدەگات. گەر بیەوێ، دەتوانێ تەنیا بەهێزی باکە ئەم سەربازگەیە وێران بکات.»

پیاوەکان پێکەنین. ئەوان بەکاولکاری جەنگ ڕاهاتبوون، دەشیانزانی بایەکە زیانێکی زۆریان پێناگەیەنێ. هێشتاش دڵیان خێراتر لێیدەدا. ئەوان پیاوی بیابان و جادووگەری مەترسیدار بوون.

سەرتیپەکە گوتی، «دەمەوێ ئەو کارە بکات.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «سێ ڕۆژی پێویستە. بۆ سەلماندنی هێزەکەی، دەبێ خۆی بگۆڕی بەبا. گەر نەیتوانی، لەبەر شانازی هۆزەکەتان ژیانمان پێشکەشی ئێوە دەکەین.»

بەفیزەوە گوتی، «ناتوانی شتێکم پێشکەش کەیت، کە خۆم خاوەنی بم.» بەڵام سێ ڕۆژ مۆڵەتی بەگەشتیارەکان دا.

کوڕەکە لەترسا دەلەرزی، بەڵام کیمیاگەرەکە یارمەتیدا لەچادرەکە بچێتە دەرێ.

کیمیاگەرەکە گوتی، «ڕێگە مەدە هەست بەترسەکەت بکەن. ئەوان مرۆڤی ئازادن و ترسنۆکەکان تڕۆ دەکەن.»

بەڵام کوڕەکە نەیدەتوانی قسە بکات. تا نەگەیشتە ناوەڕاستی سەربازگەکە، نەیتوانی هیچ بڵێ. پێویستی نەدەکرد زیندانی بکرێن: عەرەبەکان تەنیا دەستیان بەسەر ئەسپەکانیاندا گرت. جارێکی دیش، جیهان زمانە زۆرەکانی خۆی ئاشکراکرد: تەنیا چەند خولەکێ بەر لەو کاتە، بیابانەکە ناکۆتا و ئازاد بوو، بەڵام ئێستا بووبووە دیوارێکی داخراو.

کوڕەکە گوتی، «ئەوەی هەمبوو دات بەوان! هەموو ئەوەی لەتەواوی ژیانمدا پاشەکەوتم کردبووو!»






کیمیاگەرەکـە لەوەڵامـدا گوتـی، «جـا چ سـوودێکی هەیـە گـەر بمـری؟ پارەکـەت بـۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ ڕزگاری کردیـن. هەمیشـە پـارە ژیانـی مـرۆڤ ڕزگار نـاکات.»

بـەڵام کوڕەکـە زۆر لەگوتنـی وشـەی ژیرانـە ترسـابوو. نەیدەزانـی چـۆن خـۆی بگـۆڕێ بەبـا. ئـەو کیمیاگـەر نەبـوو!

کیمیاگەرەکـە داوای چـای لەسـەربازەکان کـرد و هەندێکی بەمەچەکی کوڕەکـەدا ڕشـت. شـەپۆلێکی ژیانـەوە ڕۆحـی شـتەوە و کیمیاگەرەکـەش چەنـد وشـەیەکی لەبـەر خۆیـەوە گـوت، کـە کوڕەکـە لێـی تێنەگەیشـت.

کیمیاگەرەکـە بەدەنگێکـی زۆر نیـان گوتـی، «مەهێڵـە تـرس بەسـەرتا زاڵ بـێ. گـەر ڕێگـە بەیـت، ناتوانـی لەگـەڵ دڵتـدا بدوێیـت.»

«بەڵام نازانم چۆن خۆم بگۆڕم بەبا.»

«ئەگـەر کەسـێ لەچارەنووسـی خۆیـدا بـژی، هەمـوو ئـەو شـتانە دەزانـێ، کـە پێویسـتە بیانزانـێ. تەنیـا شـتێک دەتوانـێ نەهێنانـە دی خەونێـک مەحـاڵ بـکات: ترسـان لەشکسـت.»

«لـە شکسـت ناترسـم. کێشـەکە تەنیـا ئەوەیـە، کـە نازانـم چـۆن خـۆم بگـۆڕم بەبـا.»

«کەواتە دەبێ فێربی؛ ژیانت پشتی بەوە بەستووە.»

«بەڵام ئەی ئەگەر نەتوانم؟»

«ئەوکاتـە لەناوەڕاسـتی هێنانـەدی خەونەکەتـدا دەمـری. ئەوەیـش لەمردنـی ملیۆنـان خەڵکـی تـر باشـترە، ئـەو کەسـانەی هەرگیـز نەیانزانیـووە چارەنووسـیان چییـە.»

کیمیاگەرەکـە بـەردەوام بـوو، «بـەڵام نیگـەران مەبـە، هەندێکجـار ترسـی مـەرگ وادەکات، مـرۆڤ زیاتـر وریـای ژیانـی بـێ.»

یەکـەم ڕۆژ تێپـەڕی. جەنگێکـی جیـدی لـەو نزیکانـە ڕوویـدا و ژمارەیـەک بریـندار هێندرانـەوە بـۆ سـەربازگەکە. سـەربازە مـردووەکان







جێگەیان گیرایەوە و ژیان بەردەوام بوو. کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، مەرگ هیچ شتێ ناگۆڕێ.

سەربازێک بەجەستەی بێگیانی یەکێک لەهاوەڵەکانی گوت، «دەی با دواتر بمردبایت. دوای ئەوەی ئاشتی بەرقەرار دەبوو. بەڵام هەر دەمزانی دەمریت.»

لەکۆتایی ڕۆژەکەدا، کوڕەکە ڕۆیشت تا بۆ کیمیاگەرەکە بگەڕێ، کە بازەکەی بۆناو بیابانەکە ناردبوو.

کوڕەکە دووبارە گوتی، «هێشتا نازانم چۆن ببم بەبا.»

«لە یادت بێ چیم پێگوتیت: جیهان تەنیا ڕووخسارێکی دیاری خودایە. کیمیاش تەنیا بێخەوشی ڕۆحانی دەخاتە ناو شتی بەرجەستەوە.»

«چی دەکەیت؟»

«خواردن بەبازەکەم دەدەم.»

کوڕەکە گوتی، «ئەگەر نەتوانم خۆم بگۆڕم بەبا، دەمریت، ئیتر بۆ خواردن بەبازەکەت دەدەیت؟»

کیمیاگەرەکە گوتی، «ڕەنگە تۆ بمریت. من دەزانم چۆن خۆم بگۆڕم بەبا.»



لە ڕۆژی دووەمدا، کوڕەکە بەلاپاڵێکی نزیک سەربازگەکەدا هەڵزنا. پاسەوانەکان ڕێگەیاندا بڕوات؛ ئەوان بیستبوویان کوڕەکە ئەو جادووگەرەیە، کە دەتوانێ خۆی بگۆڕێ بەبا، لەبەر ئەوە نەیاندەویست لێی نزیک بکەونەوە. لەهەرحاڵەتێکدا بێ، بیابانەکە شوێنێ نەبوو بتوانی بەپێ گوزەری تیا بکەیت.






تەواوی ئەو پاشنیوەڕۆیەی بەتەماشاکردنی بیابانەکە و گوێگرتن لەدەنگی باکە بەسەر برد. کوڕەکە دەیزانی بیابانەکە هەستی بەترسەکەی کردووە.

ئەوان هەردوو بەهەمان زمان دەدوان.



لە ڕۆژی سێیەمدا، سەرتیپەکە لەگەڵ ئەفسەرەکان کۆبووەوە.

کیمیاگەرەکەی بۆ کۆبوونەوەکە بانگکرد و گوتی، «با بڕۆین سەیری ئەو کوڕە بکەین، کە خۆی دەگۆڕێ بەبا.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «فەرموو.»

کوڕەکە بردنی بۆ ئەو لاپاڵەی، کە ڕۆژی پێشوو بۆیچووبوو. داوایکرد هەموویان دابنیشن.

کوڕەکە گوتی، «ماوەیەکی پێدەچێ.»

سەرتیپەکە لەوەڵامدا گوتی، «پەلەمان نییە. ئێمە بیابانشینین.»

کوڕەکە تەماشای ئاسۆی کرد. لەدوورەوە چیا دیاربوو. لەناو ئەو چیایانەدا، کە ژیان تێیاندا مەحاڵ بوو، گردەبا و بەرد و دەوەن سووربوون لەسەر درێژەدان بەژیانیان. ئەو بیابانەی بۆ ماوەی چەندین مانگ پێیدا ڕۆیشتبوو، لەبەر دەمیدا بوو؛ سەرەڕای ئەو هەموو ماوەیەش، بەشێکی کەمی شارەزا بووبوو. لەو بەشە بچووکەشدا، پیاوێکی ئینگلیز، کاروانێک، جەنگی هۆزەکان و مێرگێکی دۆزیبووەوە، کە پەنجاهەزار دارخورما و سێسەد بیری ئاوی تیابوو.

بیابانەکە لەکوڕەکەی پرسی، «ئەمڕۆ لێرە چیت دەوێ؟ ئایا دوێنێ کاتی تەواوت لەتەماشاکردنی مندا بەسەر نەبرد؟»

کوڕەکە گوتی، «لە شوێنێکی خۆتدا خۆشەویستەکەمت






هەڵگرتووە. کاتێ تەماشای دەنکە لمەکانت دەکەم، هەست دەکەم ئەویش دەبینم. دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆلای، بۆیە دەمەوێ یارمەتیم بدەیت خۆم بگۆڕم بەبا.»

بیابانەکە پرسی، «خۆشەویستی چییە؟»

«خۆشەویستی فڕینی بازەکەیە بەسەر لمەکەتدا، لەبەر ئەو، تۆ دەبیتە کێڵگەیەکی سەوز و ئەویش هەمیشە دەتوانێ ڕاوی خۆی بکات. ئەو شارەزای گردەبا و گاشەبەرد و چیاکانتە، تۆش بەخشندەی بەرامبەری.»

بیابانەکە گوتی، «دەنووکی بازەکە تۆزقاڵێکی لەمن هەڵگرتووە. ساڵانێکە وریای ڕاوکردنیم، لەو ئاوە کەمەی هەمە، تینوێتییەکەی دەشکێنم، هەمیشەش نێچیری خۆی پیشان دەدەم. ڕۆژێکیش کەیفم بەو ڕاستییە هات، کە ڕاوەکان لەسەر ڕووکاری من دەکرێن، بازەکە بەئاسماندا دەفڕێ و ئەوە دەبات، کە من ئافراندوومە.»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «هەر لەبەر ئەوەشە ڕاوت خوڵقاندووە. تا بەو شێوەیەش بتوانی خواردن بەبازەکە بدەیت. بازەکەش خواردن بەمرۆڤ دەدات. وردە وردە، مرۆڤیش خواردن بەدەنکە لمەکانت دەدات، ئەو شوێنەی دووبارە ڕاوی لێدروست دەبێتەوە. جیهان بەو شێوەیە دەڕوات.»

«کەواتە ئەوە خۆشەویستییە؟»

«بەڵێ، ئەوە خۆشەویستییە. ئەوەیە کە ڕاودەکات بەباز، بازدەکات بەمرۆڤ، مرۆڤیش دەکاتە بیابان. ئەوەیە کە قوڕقوشم دەکات بەئاڵتوون و ئاڵتوونیش بۆ زەوی دەگێڕێتەوە.»

بیابانەکە گوتی، «تێناگەم باسی چی دەکەیت.»

«بەڵام لانی کەم تێدەگەیت، کە لەشوێنێکتدا کچێک چاوەڕێی من دەکات. هەر لەبەر ئەوەشە، کە دەبێ خۆم بگۆڕم بەبا.»







بۆ ماوەی چەند خولەکێ بیابانەکە وەڵامی نەدایەوە.
پاشان پێی گوت، «دەتوانم دەنکە لمەکانمت پێببەخشم، تا یارمەتی هەڵکردنی باکە بدەم، بەڵام بەتەنیا ناتوانم هیچ بکەم. دەبێ داوای یارمەتی لەباکە بکەیت.»
شنەبایەک هەڵیکرد. هۆزنشینەکان لەدوورەوە تەماشای کوڕەکەیان دەکرد، لەناو خۆیاندا بەزمانێک دەدوان، کە کوڕەکە لێیان تێنەدەگەیشت.
کیمیاگەرەکە بزەیکرد.
بایەکە لەکوڕەکە نزیکبووەوە و بەر دەموچاوی کەوت. دەیزانی لەگەڵ بیابانەکە قسەیکردووە، چونکە با ئاگای لەهەموو شتێکە. لەناو جیهاندا بەبێ شوێنی دەست پێکردن هەڵدەکەن و کۆتاییشیان نییە.
کوڕەکە گوتی، «یارمەتیم بدە. ڕۆژێک لەڕۆژان دەنگی خۆشەویستەکەمت بۆ هێناوم.»
«کێ فێری کردوویت بەزمانی بیابان و با بدوێیت؟»
کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «دڵم فێریکردووم.»
با چەندین ناوی هەیە. لەو بەشەی جیهاندا پێی دەگوترا تەڕەبا، چونکە لەزەریاکانەوە شێی بۆ خۆرهەڵات دەهێنا. لەو شوێنە دوورەی کوڕەکەی لێوە هاتبوو، پێی دەگوترا بای مەشرق، چونکە بڕوایان وابوو لمی بیابانەکە و ناڵەی جەنگی موورەکانی هێناوە. ڕەنگە لەپشتی ئەو لەوەرگایانەوە، کە مەڕەکانی لێدەژیان، خەڵکی پێیان وابووبێ باکە لەئەندەلووسیاوە هەڵدەکات. بەڵام لەڕاستیدا باکە لەهیچ شوێنێکەوە نایە و ناشچێ بۆ هیچ کوێ؛ هەر لەبەر ئەوەیە لەبیابان بەهێزترە. ڕەنگە ڕۆژێک کەسێک دار لەبیابانەکەدا بڕوێنێ، تەنانەت مەڕیشی لێ بەخێو بکات، بەڵام ناتوانێ بایەکە وەدەرنێ.







باکە گوتی، «ناتوانی ببی بەبا. ئێمە دوو شتی زۆر جیاوازین.»

کوڕەکە گوتی، «ئەوە ڕاست نییە. نهێنییەکانی کیمیاگەرەکە لەگەشتەکانمدا فێربووم. با، بیابان، زەریا، ئەستێرە و هەموو شتە ئافرێندراوەکانی گەردوون لەناو مندا بوونیان هەیە. هەموومان بەهەمان دەست دروستکراوین و هەمان ڕۆحمان هەیە. دەمەوێ وەک تۆ بم، بگەمە هەموو سووچێکی جیهان، لەدەریاکان بپەڕمەوە، لمی سەر سامانەکەم لابدەم و دەنگی ئەو ژنە هەڵبگرم، کە خۆشمدەوێ.»

باکە گوتی، «گوێم لێبوو ڕۆژی پێشوو لەگەڵ کیمیاگەرەکە باسی چیتان دەکرد. ئەو گوتی هەموو شتێ چارەنووسی خۆی هەیە. بەڵام خەڵکی ناتوانن خۆیان بگۆڕن بەبا.»

کوڕەکە گوتی، «تەنیا فێرم بکە چەند خولەکێ ببمە با. دواتریش دەتوانین باسی ئەگەرە بێسنوورەکانی خەڵک و با بکەین.»

زانخوازی هەستی بایەکەی بزواند، ئەو شتەش پێشتر ڕووینەدابوو. حەزیدەکرد باسی ئەو شتانە بکا، بەڵام نەیدەزانی چۆن مرۆڤ بکاتە با. سەیرکە، باکە دەیتوانی ئەو هەموو شتە بکات! بیابانەکەی دروستکردووە، کەشتی نوقوومکردووە، تەواوی دارستانەکانی پڕکردووەتەوە و لەو شارانەدا هەڵیکردووە، کە پڕبوون لەمیوزیک و دەنگی سەیر. وادەردەکەوت هیچ سنوورێکی نەبێ، بەڵام ئێستا کوڕێک دەیگوت باکە دەتوانێ شتی تریش بکات.

بۆی دەرکەوت بایەکە لەبەخشینی ئەوە نزیکبووەتەوە، کە داوایکردبوو، کوڕەکە گوتی، «ئەوە ئەو شتەیە، کە بەخۆشەویستی ناوی دەبەیت. کاتێ خۆشدەویستریێ، دەتوانی لەجیهاندا هەموو شتێ بکەیت. کاتێ خۆشیاندەوێی، پێویست ناکا بزانی چی ڕوودەدات، چونکە هەموو شتێ لەناخی خۆتا ڕوودەدات و تەنانەت مرۆڤیش







دەتوانێ خۆی بگۆڕێ بەبا. بەدڵنیاییەوە ئەگەر بایەکە یارمەتی بدات.»

باکە بەشکۆ بوو، بەڵام ئێستا بەقسەکانی کوڕەکە چارس بووبوو. توندتر هەڵیکرد و لمی بیابانەکەی بەرزکردەوە. بەڵام لەکۆتاییدا بۆیدەرکەوت، ئەگەر هەموو جیهانیش ببڕێ، هێشتا نازانێ چۆن مرۆڤ بگۆڕێ بەبا. هیچ شتێکی لەبارەی خوشەویستییەوە نەدەزانی.

باکە شێتگیربوو بەوەی دانی بەسنوورەکانی خۆیدا نا، گوتی، «لە گەشتەکانمدا، زۆرینەی خەڵکیم بینیووە باسی خۆشەویستییان کردووە و تەماشای ئاسمانیان کردووە. ڕەنگە واباشتربێ داوا لەخۆر بکەیت.»

کوڕەکە گوتی، «کەواتە هاوکاریم بکە. ئەم ناوچەیە بەگێژەڵووکەیەکەی لمینی بەهێز دابپۆشە، تا خۆرەکە بشاردرێتەوە. ئەوکاتە دەتوانم بەبێ چاوداخستن تەماشای ئاسمان بکەم.»

باکە بەهەموو هێزی خۆی هەڵیکرد و ئاسمانی پڕ لەلم کرد. خۆرەکە وەک خەپلەیەکی ئاڵتوونی دەردەکەوت.

زەحمەتبوو لەسەربازگەکەوە شتێ ببیندرێ. پیاوانی بیاباننشین بەو بایە ئاشنابوون. بەو بایەیان دەگوت سایموم و لەزریانی دەریا خراپتر بوو. ئەسپەکان کەوتنە حیلە و تفەنگەکانیان پڕبوون لەلم.

لە بەرزاییەکانەوە، یەکێک لەفەرماندەکان ڕووی بۆ سەرتیپەکە وەرگێڕا و گوتی، «ڕەنگە واباشتر بێ کۆتایی بەمە بهێنین!»

بەزەحمەت کوڕەکەیان دەبینی. دەموچاویان بەپەڕۆ شینەکان داپۆشرابوو و ترس بەچاویانەوە دیاربوو.

فەرماندەیەکی تر گوتی، «با بیوەستێنین.»

سەرتیپەکە بەرێزەوە گوتی، «دەمەوێ مەزنی ئەڵڵا ببینم. دەمەوێ ببینم چۆن مرۆڤ خۆی دەگۆڕێ بەبا.»

بەڵام تێبینی ناوی ئەو دوو کەسەی کرد، کە ترسی خۆیان ئاشکراکردبوو. هەر کە بایەکە دەوەستا، لەکارەکانی خۆیان لایدەبردن، چونکە پیاوانی ڕەسەنی بیابانشین هەرگیز ناترسێن.

کوڕەکە بەخۆری گوت، «باکە پێی گوتم تۆ لەخۆشەویستی تێدەگەیت. ئەگەر بەخۆشەویستی ئاشنابی، دەبێ شارەزای ڕۆحی جیهانیش بی، چونکە لەخۆشەویستی دروستبووە.»

خۆرەکە گوتی، «لەم شوێنەوە دەتوانم ڕۆحی جیهان ببینم. لەگەڵ ڕۆحمدا دەدوێت و پێکەوە دەبینە هۆکاری گەشەکردنی ڕووەکەکان و ڕێگە بەمەڕەکان دەدەین بگەڕێن بەدووی خۆراکدا. لێرەوە - هەرچەندە زۆر لەزەوییشەوە دوورم - فێری خۆشەویستی بووم. دەزانم گەر یەک تۆزیتر نزیک ببمەوە، هەموو شتێ دەمرێت و ئیدی ڕۆحی جیهان بوونی نامێنێ. بەو شێوەیەش ئێمە بیر لەیەکتر دەکەینەوە و یەکترمان خۆشدەوێ، من ژیان و گەرمی پێدەبەخشم و ئەویش هۆکارم بۆ ژیان دەداتێ.»

کوڕەکە گوتی، «کەواتە دەزانی خۆشەویستی چییە.»

«ڕۆحی جیهانیش دەناسم، چونکە لەم گەشتە بێکۆتایەی گەردووندا، هەمیشە قسە لەگەڵ یەکدا دەکەین. پێم دەڵێ هەتا ئێستا گەورەترین کێشەی ئەوەیە، کە تەنیا کانزا و ڕووەکەکان لەوە تێدەگەن هەموو شتەکان یەکن. لەبەر ئەوە پێویست ناکا ئاسن وەک مس بێ، یان مس وەک ئاسن بێ. هەر شتە وەک ئافەریدەیەکی بێهاوتا کاری خۆی دەکات، هەموو شتێکیش دەبووە سەمفۆنیایەکی ئاشتی، ئەگەر ئەو دەستەی هەموو ئەم شتانەی نووسیووە، لەپێنجەم ڕۆژی ئافراندندا بووەستابایە.»

خۆر بەردەوامبوو، «بەڵام ڕۆژی شەشەمیش لەئارادابوو.»

کوڕەکە گوتی، «تۆ ژیریت، چونکە لەدوورەوە تێبینی هەموو







شتەکان دەکەیت. بەڵام نازانی خۆشەویستی چییە. ئەگەر ڕۆژی شەشەم نەبایە، ئەوا مرۆڤ بوونی نەدەبوو؛ مس هەر مس و قورقوشمیش هەر قورقوشم دەبوو. ڕاستە هەموو شتێ چارەنووسی خۆی هەیە، بەڵام ڕۆژێ چارەنووسەکە بەدی دێت. بۆیە دەبێ هەر شتێک خۆی بگۆڕێ بەشتێکی باشتر، کە چارەنووسێکی نوێ بۆخۆی بنیات بنێ، هەتا ڕۆژێک دێ، کە ڕۆحی جیهان دەبێتە تاکە شت.»

خۆرەکە بیری لەوە کردەوە و بڕیاریدا ڕوونتر بدرەوشێتەوە. بایەکە، کە کەیفی بەگفتوگۆکە دەهات، توندتر هەڵیکرد، تا خۆرەکە نەتوانێ چاوی کوڕەکە کوێر بکات.

کوڕەکە گوتی، «هەر لەبەر ئەوەیە کیمیا بوونی هەیە. تا هەموو کەسێ بەدووی سامانی خۆیدا بگەڕێ، بیدۆزێتەوە و حەزبکات لەپێشتر باشتر بژی. قورقوشم دەوری خۆی دەبینێ، تا ئەو کاتەی جیهان پێویستی بەقورقوشم نامێنێ؛ ئەوجا قورقوشم ڕێگە دەدات بکرێتە ئاڵتوون.

«کیمیاگەرەکان ئەو کارە دەکەن. ئەوان پیشانمان دەدەن، کاتێ کۆشش دەکەین تا لەخۆمان باشتر بین، هەموو شتەکانی چواردەوریشمان لەگەڵ ئێمەدا باشتر دەبن.»

خۆر لەکوڕەکەی پرسی، «ئەی بۆچی گوتت من نازانم خۆشەویستی چییە؟»

«چونکە خۆشەویستی شتێک نییە وەک بیابانەکە جێگیر بێ، ئەوەش نییە وەک بایەکە بەجیهاندا بگەڕێ. ئەوەش نییە وەک تۆ هەموو شتێ لەدوورەوە ببینێ. خۆشەویستی ئەو هێزەیە، کە ڕۆحی جیهان بەرەو پێش دەبات و دەیگۆڕێ. کاتێ پێی گەیشتم، پێم وابوو ڕۆحی جیهان بێخەوش بێ. بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت، کە هەر وەک

شێوەکانی دیکە ئافرێندراو، خاوەن سۆز و جەنگی خۆیەتی. ئەوە ئێمەین، کە خواردن بەڕۆحی جیهان دەدەین، باشبوون و خراپبوونی ئەو جیهانەش کە تێیدا دەژین، پشتی بەباشبوون و خراپبوونی ئێمە بەستووە. ئا لەوێوە هێزی خۆشەویستی دێتە ژوورێ. چونکە کاتێ عاشق دەبین، هەمیشە هەوڵ دەدەین لەخۆمان باشتر بین.»

خۆر پرسی، «ئەی چیت دەوێ لەمن؟»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «دەمەوێ یارمەتیم بەیت خۆم بگۆڕم بەبا.»

خۆر گوتی، «سروشت منی بەژیرترین ئافرێندراوی گەردوون داناوە، بەڵام نازانم چۆن بتگۆڕم بەبا.»

«ئەی لەکێ بپرسم؟»

خۆرەکە ماوەی خولەکێ بیری کردەوە. باکە لەنزیکەوە گوێی گرتبوو و حەزیدەکرد بەهەموو جیهان ڕابگەیەنێ، کە ژیریی خۆریش سنووردارە. ناشتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەم کوڕە بکات، کە بەزمانی جیهان دەدوێ.

خۆر گوتی، «لەگەڵ ئەو دەستە قسە بکە، کە هەموو شتێکی نووسیووە.»

باکە بەدڵخۆشی هاواریکرد و لەهەموو کاتێکی دیکە توندتر هەڵیکرد. چادرەکان کەوتن و ئاژەڵەکانیش لەڕەشمەکانیان ئازادبوون. لەلاپاڵەکەدا، پیاوەکان یەکتریان گرتبوو، تا با نەیانبات.

کوڕەکە ڕووی بۆ ئەو دەستە وەرگێڕا، کە هەموو شتێکی نوسیووە. لەو کاتەدا هەستی کرد تەواوی گەردوون بێدەنگ بووە و بڕیاریدا قسە نەکات.

تەوژمێکی خۆشەویستی هاتە دڵی و کوڕەکە دەستیکرد بەنزاکردن. نزایەک بوو، کە هەرگیز نەیبیستبوو، چونکە نزایەکی







بێ وشە و تکاکاری بوو. نزاکەی بۆ سوپاسکردنی مەڕەکانی نەبوو، لەبەرامبەر دۆزینەوەی پاوانێکی نوێدا؛ بۆ ئەوەش نەبوو کوڕەکە بتوانێ کریستاڵی زیاتر بفرۆشێ؛ پاڕانەوەش نەبوو بۆ ئەوەی ئەو ژنەی بینیبووی بەردەوام چاوەڕێی بکات. لەبێدەنگییەکەدا، کوڕەکە تێگەیشت کە بیابانەکە، باکە و خۆرەکەش هەوڵیاندەدا لەو هێمایانە تێبگەن، کە دەستەکە نووسیونی، دەیانویست دوای ڕاڕەوی خۆیان بکەون و لەوە تێبگەن، کە لەسەر تابلۆی زمروتەکە نووسراوە. بینی پێشهات لەسەر زەوی و لەبۆشاییدا بڵاوبووەتەوە و لەوەش ناچن، کە دەبیندرێن؛ بۆیەدەرکەوت نە بیابانەکە، نە باکە، نە خۆرەکە و نە خەڵکیش نازانن بۆچی دروستکراون. بەڵام دەستەکە هۆکاری هەموو ئەمانەی دەزانی، تەنیا ئەویش دەیتوانی پەرجوو بئافرێنێ، یان دەریا بکاتە بیابان ... یان مرۆڤ بگۆڕێ بەبا. چونکە تەنیا دەستەکە تێدەگەیشت، کە نەخشەیەکی گەورەتر گەردوونی بردووەتە خالێک، کە شەش ڕۆژی ئافراندن کردوویەتیە کاری ناوازە.

کوڕەکە گەیشتە ناو ڕۆحی جیهان و بینی کە ئەویش بەشێکە لەڕۆحی خودا. بینی کە ڕۆحی خودایش ڕۆحی خۆیەتی. خۆیشی دەیتوانی پەرجوو بئافرێنێ.



ئەو ڕۆژە سایموم بەشێوەیەک هەڵیکرد، کە هەرگیز پێشتر وا هەڵینەکردبوو. بۆ ماوەی چەندین نەوەی دواتر، عەرەبەکان ئەفسانەی ئەو کوڕەیان دەگێڕایەوە، کە خۆی گۆڕیبوو بەبا و لەبەرەنگاری بەهێزترین سەرتیپی بیابانەکەدا، خەریکبوو سەربازگەیەک کاول بکات.

کاتێ سایموم وەستا، هەموویان تەماشای شوێنی کوڕەکەیان

لەبەشێکی دووری سەربازگەکە و
دەکرد. بەڵام ئیدی لەوێ نەمابوو؛
بەتەنیشت سەربازێکی بەلم داپۆشراوەوە بوو.
پیاوەکان لەجادووەکەی ترسابوون. بەڵام دوو کەس دەخنین:
کیمیاگەرەکە، چونکە شاگردێکی بێخەوشی بۆخۆی دۆزیبووەوە،
سەرتیپەکەش، چونکە شاگردەکە لەشکۆی خودا تێگەیشتبوو.
ڕۆژی دواتر، سەرتیپەکە ماڵئاوایی لەکوڕەکە و کیمیاگەرەکە کرد
و کۆمەڵێک خەڵکی لەگەڵدا ناردن، تا ئەو کاتەی خۆیان دەیانەوێ
یاوەرییان بکەن.



تەواى ڕۆژەکە ڕۆیشتن. لەکۆتایی پاشنیوەڕۆکەدا گەیشتنە
پەرستگایەکی قبتی. کیمیاگەرەکە لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و
بەکۆمەڵەکەی گوت بگەڕێنەوە بۆ سەربازگەکە.
کیمیاگەرەکە گوتی، «ئیتر لێرەوە بەتەنیا دەبی. تەنیا سێ
کاتژمێر لەهەرەمەکانەوە دووریت.»
کوڕەکە گوتی، «سوپاس. تۆ زمانی جیهانت فێرکردم.»
«تەنیا یارمەتی باشکردنی ئەوەم دا، کە خۆت دەتزانی.»
کیمیاگەرەکە لەدەرگای پەرستگاکەی دا. ڕەبەنێکی بەرگ ڕەش
هاتە دەرەوە. چەند خولەکێ بەقبتی قسەیانکرد و کیمیاگەرەکەش
داوای لەکوڕەکە کرد بچێتە ژوورێ.
کیمیاگەرەکە بەبزەوە گوتی، «داوام لێیکرد ڕێگەم بدات ماوەیەک
چێشتخانەکە بەکاربهێنم.»
چوونە چێشتخانەکەی پشتی پەرستگاکەوە. کیمیاگەرەکە
ئاگرەکەی داگیرساند، ڕەبەنەکەش هەندێک قورقوشمی بۆ هێنا،







پاشان کیمیاگەرەکە خستییە ناو مەنجەڵێکی ئاسنەوە. کاتێ قورقوشمەکە شل بووەوە، کیمیاگەرەکە هێلکە زەردە سەیرەکەی لەجانتاکەی دەرهێنا. تەڵەزمێکی مووئاساس لەهێلکەکە کردەوە، لە هەندێک مۆمیەوەی پێچا و خستیە ناو ئەو مەنجەڵەی قورقوشمەکەی تیا توابووەوە.

ڕەنگی تێکەڵەکە سوور هەڵگەڕا، تەقریبەن سوورێکی خوێنین بوو. کیمیاگەرەکە مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگرەکە لابرد و دایناتا سارد ببێتەوە. لەو کاتەدا لەگەڵ ڕەبەنەکە باسی جەنگی هۆزەکانیان دەکرد.

بە ڕەبەنەکەی گوت، «وابزانم زۆر دەخایەنێ.»

ڕەبەنەکە جاڕس بوو. کاروانەکان بۆ ماوەیک لەغیزا لایاندابوو و چاوەڕوانی کۆتایی جەنگەکان بوون. گوتی، «بەڵام ویستی خودا دەگاتە جێ.»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «ڕاستە.»

کاتێ مەنجەڵەکە ساردبووەوە، ڕەبەنەکە و کوڕەکە بەسەرسوڕماوی تەماشایانکرد. قورقوشمەکە شێوەی مەنجەڵەکەی وەرگرتبوو و وشک بووبووەوە، بەڵام ئیدی قورقوشم نەبوو. ئاڵتوون بوو.

کوڕەکە گوتی، «ئایا ڕۆژێک فێری ئەوە دەبم؟»

کیمیاگەرەکە لەوەڵامدا گوتی، «ئەمە چارەنووسی منە، نەک هی تۆ. بەڵام ویستم نیشانتیبدەم شتەکە مەحاڵ نییە.»

گەڕانەوە بۆ دەروازەکانی پەرستگاکە. لەوێدا کیمیاگەرەکە خەپلەکەی کرد بەچوار بەشەوە.

پارچەیەکی بۆ ڕەبەنەکە ڕاگرت و گوتی، «ئەمە بۆ تۆ، بۆ بەخشندەییت بەرامبەر حاجییەکان.»

ڕەبەنەکە لەوەڵامدا گوتی، «بەڵام ئەمە زۆر لەوە زیاترە.»






«جارێکی تر وامەڵێ. ڕەنگە ژیان گوێی لێبێ و جاری داهاتوو کەمترت پێببەخشێ.»

کیمیاگەرەکە ڕووی بۆ کوڕەکە وەرگێڕا. «ئەمەیان بۆ تۆ. لەجێی ئەوەی بەسەرتیپەکەت بەخشی.»

خەریکبوو کوڕەکە بڵێ زۆر لەوە زیاترە، کە بەژەنەڕاڵەکەی بەخشیبوو. بەڵام بێدەنگ بوو، چونکە گوێی لێبوو کیمیاگەرەکە چی بەڕەبەنەکە گوت.

کیمیاگەرەکە بەشێکی هەڵگرت و گوتی، «ئەمەش بۆ من. چونکە دەبێ بگەڕێمەوە بۆ ناو بیابانەکە، ئەو شوێنەی جەنگی هۆزەکانی تیایە.»

چوارەم بەشی بۆ ڕەبەنەکە ڕاگرت.

«ئەمەش بۆ کوڕەکە. گەر ڕۆژێ لەڕۆژان پێویستی پێی بوو، بیدەرێ.»

کوڕەکە گوتی، «بەڵام من دەڕۆم بۆ سامانەکەم دەگەڕێم.»

کیمیاگەرەکە گوتی، «منیش دڵنیام لەوەی دەیدۆزیتەوە.»

«ئەی ئەمە بۆ؟»

«چونکە دوو جاران پارە پاشەکەوتکراوەکەت لەدەستداوە. جارێک بەبۆنەی دزێکەوە و جارێکیش بەبۆنەی فەرماندەکەوە. من عەرەبێکی پیری بڕوا پووچم، بڕواش بەهەموو پەندەکان دەکەم. یەکێک لەپەندەکانمان دەڵێ، شتێک کە جارێک ڕوویدا، ئیدی ڕوونادات‌ەوە. بەڵام گەر دوو جاران ڕوویدا، بەدڵنیاییەوە سێبارەش دەبێتەوە.« پاشان سواری ئەسپەکانیان بوون.







کیمیاگەرەکە گوتی، «دەمەوێ چیرۆکێکت لەبارەی خەونەوە بۆ بگێڕمەوە.»

کوڕەکە ئەسپەکەی نزیکترکردەوە.

«لە سەردەمی ڕۆمانی کۆندا، کاتی ئیمپڕاتۆر تیبریوس، پیاوێکی باش هەبوو و خاوەنی دوو کوڕ بوو. یەکێکیان لەخزمەتی سەربازییدابوو و بۆ دوورترین هەرێمەکانی ئیمپڕاتۆرەکە نێردرابوو. کوڕەکەی تریانی شاعیربوو و تەواوی ڕۆمای بەدێڕە جوانەکانی کامەران کردبوو.

«شەوێکیان باوکی خەونی بینی. فریشتەیەک دەرکەوتبوو و پێی گوتبوو وشەکانی یەکێک لەکوڕەکانی بەناوبانگ دەبن و نەوەکانی دواتر لەبەریدەکەن و دەیلێنەوە. باوکەکە بەگریانەوە لەخەو ڕاما، چونکە ژیان بەخشندەبوو و شتێکی بۆ دەرخستبوو، کە هەموو باوکێ شانازی پێوە دەکات.

«لەپاش ماوەیەکی کورت، کاتێ باوکەکە دەیویست منداڵێک ڕزگار بکات، گالیسکەیەکی دووچەرخە لێیدا و مرد. چونکە تەواوی ژیانی بەڕێگەیەکی ڕاست و عەدالەت گوزەراندبوو، ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ بەهەشت و لەوێ چاوی بەو فریشتەیە کەوت، کە لەخەونیدا بینیبووی.

«فریشتەکە پێی گوت، 'هەمیشە پیاوێکی باش بوویت. بەخۆشەویستی ژیانت گوزەراندووە و بەشکۆوە مردی. ئێستا دەتوانم هەر ئارەزوویەکت هەیە بۆت جێبەجێ بکەم.'

«پیاوەکە گوتی، 'ژیان بۆ من باش بوو. کاتێ هاتیتە خەونم، پێم وابوو خەڵاتی هەموو ڕەنجەکانم کرابم، چونکە گوتت شیعرەکانی کوڕەکەم بۆ ماوەی چەندین نەوە دەمێننەوە. هیچ شتێکم بۆ خۆم ناوێ. بەڵام هەموو باوکێ شانازی بەناوبانگی کوڕەکەیەوە دەکات.







دەمەوێ لەداهاتوویەکی دووردا گوێم لەوشەکانی کوڕەکەم بێ.'

«فریشتەکە دەستی لەشانی پیاوەکەدا و هەردووکیان ڕۆیشتنە داهاتووەوە. لەناو کۆبوونەوەیەکی جەنجاڵدا بوون، هەزاران خەڵکی لێبوو و بەزمانێکی سەیر دەدوان.

«پیاوەکە لەخۆشیدا گریا.

«بە گوێی فریشتەکەدا گوتی، 'دەمزانی شیعرەکانی کوڕەکەم نەمرن. تکایە دەتوانی پێم بڵێی ئەو خەڵکە کام لەشیعرەکانی کوڕەکەم دەخوێننەوە؟'

«فریشتەکە لەپیاوەکە نزیکبووەوە و بەنیانی یارمەتیدا بچێتە سەر کورسییەکی ئەو نزیکانە دابنیشێ.

«فریشتەکە گوتی، 'دێڕەکانی کوڕە شاعیرەکەت لەڕۆمادا زۆر بەناوبانگ بوون، هەموو کەسێ حەزی پێیدەکرد. بەڵام کاتێ ڕژێمی تیبریوس کۆتایی هات، شیعرەکانی لەیاد کران. ئەو وشانەی ئێستا گوێت لێیە، هی ئەو کوڕەتن، کە لەخزمەتی سەربازییدا بوو.'

«پیاوەکە بەسەرسوڕماوی تەماشای فریشتەکەی کرد.

«'کوڕەکەت لەشوێنێکی دوور خزمەتیکرد و بووە فەرماندە. کەسێکی چاک و عەدالەت بوو. پاشنیوەڕۆیەک، یەکێک لەخزمەتکارەکانی نەخۆشکەوت و وادەردەکەوت بمرێ. کوڕەکەت باسی ڕابییەکی بۆ کرابوو، کە دەیتوانی نەخۆشی چاکبکاتەوە، ئەوجا سێ ڕۆژان ئەسپ سواریی کرد تا بەدوویدا بگەڕێ. لەڕێگە بۆیدەرکەوت ئەو پیاوە بەدوویدا وێڵە، کوڕی خودایە. خەڵکانی دیکەی بینی، کە ئەو چاکیکردبوونەوە و باسی شارەزایی ئەو پیاوە بۆ کوڕەکەت دەکرا. سەرەڕای ئەوەی ئەو فەرماندەیەکی ڕۆمانییش بوو، بەڵام چووە سەر باوەڕی ئەوان. لەپاش ماوەیەکی کورت، گەیشتە شوێنێک، کە ئەو پیاوەی بەدوویدا دەگەڕا، سەردانیدەکرد.'







«پێی گوت یەکێک لەخزمەتکارەکانت نەخۆشە و ڕابییەکەش خۆی ئامادەکرد لەگەڵیدا بڕوات بۆ ماڵەکەی. بەڵام فەرماندەکە پیاوێکی باوەڕداربوو و بەتەماشاکردنی چاوەکانی ڕابییەکە، دەیزانی لەحزووری کوڕی خودادایە.

«فریشتەکە بەپیاوەکەی گوت، 'کوڕەکەت ئەم وشانەی گوت. ئەمانە ئەو وشانەن، کە لەویادا بەڕابییەکەی گوت و هەرگیز لەیاد نەکران: «خودایا، من هێندە بەنرخ نیم تا بێیتە ژێر بنمیچی خانووەکەم. تەنیا وشەیەک بڵێ و خزمەتکارەکەم چاکدەبێتەوە.»'»

کیمیاگەرەکە گوتی، «گرنگ نییە لەهەرکوێیەکی، هەموو کەسێکی سەر زەوی ڕۆڵێکی گرنگ لەمێژووی جیهاندا دەبینێ. زۆر بەئاساییش کەسەکە خۆی ئەوە نازانێ.»

کوڕەکە خنی. هەرگیز پێی وانەبوو پرسیار لەبارەی ژیانەوە هێندە بۆ شوانێک گرنگ بێ.

کیمیاگەرەکە گوتی، «ماڵئاوا.»

کوڕەکەش گوتی، «ماڵئاوا.»



کوڕەکە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک بەناو بیابانەکەدا ڕۆیشت و بەباشی گوێی بۆ دڵی گرتبوو. ئەوە دڵیبوو کە پێی دەگوت سامانەکەی لەکوێ شاردراوەتەوە.

کیمیاگەرەکە پێی گوتبوو، «سامانەکەت لەهەرکوێ بێ، دڵیشت لەو شوێنە دەبێ.»

بەڵام دڵی باسی شتی تری دەکرد. بەسەربەرزی چیرۆکی ئەو شوانەی دەگێڕایەوە، کە مێگەلەکەی بەجێ هێشتبوو و دوای خەونە

دووبارەکەی کەوتبوو. باسی چارەنووس و ئەو هەموو مرۆڤەی بۆ کرد، کە بەدووی زەوی دوور و ئافرەتی جواندا گەڕابوون، بەبیرۆکە پێشینە لەسەرەکانیان بەرەنگاری خەڵکی ئەو دەمەیان کردبوو. باسی گەشت و دۆزینەوەی کتێب و گۆڕانکاری دەکرد.

کاتێ دەیویست بەسەر گردەبایەکی تردا هەڵبزنێت، دڵی چرپاندی، «وریای ئەو شوێنەبە، کە دەتخاتە گریان. من و سامانەکەشت لەوێین.»

کوڕەکە بەهێواشی بەگردەباکەدا سەرکەوت. هەیڤێکی پڕ، بەئاسمانە پڕ لەئەستێرەکەوە هەڵواسرابوو: مانگێک بەسەر بەجێ هێشتنی مێرگەکەدا تێپەڕیبوو. ڕووناکی هەیڤەکە سێبەری بەناو گردەباکاندا دروستدەکرد و شێوەی دەریایەکی شەپۆلاوی دەخولْقاند؛ ئەو ڕۆژەی بەبیری کوڕەکە خستەوە، کە لەبیابانەکەدا ئەسپەکە کەوتبووە سەر پاشکۆی و کیمیاگەرەکەی ناسی. هەیڤەکەش کەوتە قووڵایی بێدەنگی بیابانەکە و گەڕانی پیاوێک بەدووی سامانەکەیدا.

کاتێ گەیشتە سەر گردەباکە، خەریکبوو دڵی لەسینەی بێتە دەرەوە. تیشکی هەیڤەکە و ڕووناکی بیابانەکە، هەڕەمە مەزن و سامناکەکانی میسر دەرکەوتن.

کوڕەکە کەوتە سەر ئەژنۆکانی و گریا. سوپاسی خودای کرد، کە وای لێکردبوو دوای چارەنووسی خۆی بکەوێ، کە ڕابەریکردبوو تا پاشایەک، بازرگانێک، پیاوێکی ئینگلیز و کیمیاگەرێک ببینێ. لەسەروو هەموو ئەو شتانەشەوە، بۆ ناسینی ئەو ئافرەتە بیابانشینەی پێی گوتبوو خۆشەویستیی مرۆڤ لەخەونەکەی دوورناخاتەوە.

ئەگەر بیویستبا، ئێستا دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ مێرگەکە، بچێتەوە بۆلای فاتیمە و وەک شوانێکی ئاسایی ژیان بگوزەرێنێ. لەپاش هەموو شتێکیش، کیمیاگەرەکە هەر لەبیابانەکە دەژیا، گەرچی لەزمانی







جیهانیش تێدەگەیشت و دەشیتوانی قورقوشم بگۆڕێ بەئاڵتوون. پێویستی نەدەکرد زانست و هونەرەکەی پیشانی هیچ کەسێک بدات. کوڕەکە بەخۆی گوت، کە لەڕێگەی بەدیهێنانی خەونەکەیدا، هەموو ئەو شتانە فێربووە کە پێویستی بووە و ئەزموونی هەموو ئەو شتانەی کردووە، کە ڕەنگە خەونی پێیانەوە بینیبێ.

بەڵام ئێستا، لەساتی دۆزینەوەی سامانەکەیدا، بەبیری خۆی هێنایەوە، کە هیچ پرۆژەیەک هەتا گەیشتن بەئامانجەکەی تەواو نابێ. کوڕەکە تەماشای چواردەوری کرد و بینی قالۆنچەیەکی ڕەش بەناو لمەکەدا ڕۆدەچێتە خوارێ. کاتێ لەبیابانەکە بوو، بیستبووی کە لەمیسر، قالۆنچەی ڕەش هێمای خودایە.

پێشهاتێکی تر! کوڕەکە دەستی بەهەڵکەندنی گردەباکە کرد. کاتێ خەریکبوو، ئەوەی بیرکەوتەوە، کە جارێک کریستاڵفرۆشەکەی گوتبووی: کە گوایا هەموو کەسێ دەتوانێ لەحەوشەی ماڵەکەیدا هەرەمێک دروست بکات. ئێستا کوڕەکە بۆیدەرکەوت، ئەگەر لەباقی ژیانیشتدا بەرد لەسەر بەرد دابنێی، ناتوانی دروستی بکەیت.

بەدرێژایی شەو کوڕەکە ئەو شوێنەی هەڵکەند، کە هەڵیبژاردبوو، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. هەستی بەزەحمەتی ئەو سەدانە دەکرد، کە هەرەمەکانی تێدا دروستکراون. بەڵام نەوەستا. لەسەر هەڵکەندن بەردەوامبوو و لەگەڵ ئەو بایەدا دەجەنگا، کە زوو زوو چاڵەکەی پڕدەکردەوە. دەستەکانی سوابوون و شەکەت بووبوو، بەڵام گوێی لەدڵی دەگرت. پێی گوتبوو ئەو شوێنە هەڵبکەنێ، کە فرمێسکەکانی لێدەڕژێنە خوارێ.

کاتێ خەریکی هەڵکەندی ئەو بەردە بوو، کە هاتبووە بەر دەستی، گوێی لەدەنگی پێبوو. چەند شکلێک لێی نزیکبوونەوە. پشتیان لەڕووناکی هەیڤ بوو، بەو شێوەیەش کوڕەکە نە چاویان







و نــە ڕووخســاریانی نەدەبینــی.

یەکێک لەشکڵەکان پرسی، «لێرە چی دەکەی؟»

چونکـە ترسـابوو، کوڕەکـە وەڵامـی نەدایـەوە. شـوێنی سامانەکەی دۆزیبـووەوە و دەترسا شـتێک ڕوویـدات.

شـکڵێکی تریـان گوتـی، «ئێمـە پەنابـەری جەنگـی هۆزەکانیـن و پێویسـتمان بەپارەیـە. چیـت لێـرەدا شـاردووەتەوە؟»

کوڕەکە لەوەڵامدا گوتی، «هیچ ناشارمەوە.»

بـەڵام یەکێکیـان کوڕەکـەی گـرت و هەڵیدایـە دەرەوەی چاڵەکـە. یەکێکـی تریـان کـە جانتـای کوڕەکـە دەگـەڕا، پارچـە ئاڵتوونەکـەی دۆزییـەوە.

گوتی، «ئاڵتوونی تیایە.»

هەیـڤ بـەڕووی ئـەو عەرەبـەدا درەوشـایەوە، کـە کوڕەکـەی گرتبوو، لەچاوەکانیـدا مەرگـی بەدیدەکـرد.

«بەدڵنیاییەوە ئاڵتوونی زیاتری لەزەوییەکەدا شاردووەتەوە.»

ڕێگەیانـدا کوڕەکـە لەسـەر هەڵکەنـدن بـەردەوام بـێ، بـەڵام هیچـی نەدۆزییـەوە. لەگـەڵ خۆرهەڵاتنـدا، دەسـتیانکرد بەلێدانـی کوڕەکـە. برینداربـوو و خوێنـی لێدەچـۆڕا، جلەکانـی دڕان و هەسـتیدەکرد مـەرگ لێـی نزیکبووەتـەوە.

کیمیاگەرەکـە گوتبـووی، «پـارە سـوودی چییـە گـەر بمری؟ هەمیشـە پـارە ناتوانـێ ژیانـی مـرۆڤ ڕزگار بـکات.» لەکۆتاییدا کوڕەکـە قیژاندی، «بۆ سـامان دەگـەڕێـم!» گـەرچـی دەمـی خوێنـی لێدەهـات و ئاوسـابوو، بـەڵام بەهێرشـبـەرەکانی گـوت، کـە دوو جـاران خـەونـی بەسـامانێکی شـاراوەی نزیـک هەرەمەکانـی میسـرەوە بینیـووە.

ئـەو پیـاوەی لەڕابـەری کۆمەڵەکـە دەچـوو، پێـی گوتـن: «لێیگەڕێن. هیچـی تـری پێنییـە. ئەڵبەتـە ئـەم ئاڵتوونەشـی دزیـووە.»







کوڕەکە کەوتە سەر لمەکە و خەریکبوو لەهۆش خۆی دەچوو.
ڕابەرەکە کوڕەکەی ڕاوەشاند و گوتی، «ئێمە دەڕۆین.»
بەڵام بەر لەوەی بڕوات، گەڕایەوە بۆلای کوڕەکە و گوتی، «تۆ نامریت. بەڵکو دەژیت و فێردەبی، کە نابێ مرۆڤ هێندە گەمژە بێ. دوو ساڵ پێش ئێستا، ڕێک لەم شوێنەدا منیش خەونێکی دووبارەم بینی. لەخەونمدا داوام لێکرا بڕۆم بۆ کێڵگەکانی ئیسپانیا و بۆ ئەو کڵێسە ڕووخاوە بگەڕێم، کە شوان و مەڕەکانیان شەوی تێدا دەکەنەوە. گوایا لەوێ دارچنارێک لەژووری کەلوپەلە پیرۆزەکان هەیە، پێم گوترا ئەگەر نزیک ڕەگەکانی ئەو دار چنارە هەڵبکەنم، سامانێکی شاراوە دەدۆزمەوە. بەڵام هێندە گەمژە نیم بیابانێکی تەواو لەپێناو خەونێکی دووبارەدا ببڕم.»
ئەوجا لەبەر چاو ونبوون.
کوڕەکە بەجەستەی لەرزیوەوە هەستایە سەر پێکانی و جارێکی تر تەماشای هەڕەمەکانی کرد. وادەردەکەوت پێبکەنن، ئەویش لەگەڵیان پێکەنی، لەخۆشیدا دڵی خەریکبوو ئاگری دەگرت.
چونکە ئێستا دەیزانی سامانەکەی لەکوێیە.





لەگەڵ هاتنی شەودا، کوڕەکە گەیشتە کڵێسە چۆڵەکە. هێشتا دار چنارەکە لەژووری کەلوپەلە پیرۆزەکاندا بوو، هێشتاش ئەستێرەکان لەبنمیچە نیمچە ڕووخاوەکەوە دەبیندران. ئەو کاتەی بیرکەوتەوە، کە لەگەڵ مەڕەکانیدا لەوێ بووبوو؛ ئەو شەوەی پێشووی هێمنبوو ... بەڵام ئەگەر ئەو خەونەی تیا نەبایە، کە بینیبووی.

ئەمجارە مێگەلەکەی نەهێنابوو، بەڵکو خاکەنازێکی پێبوو.

دانیشت و ماوەیەکی درێژ تەماشای ئاسمانی کرد. ئەوجا بتڵە شەرابێکی لەکۆڵەپشتەکەی دەرهێنا و کەمێکی لێخواردەوە. ئەو شەوەی بیرکەوتەوە، کە لەگەڵ کیمیاگەرەکە لەبیابانەکە بوون، پێکەوە شەرابیان خواردبووەوە و تەماشای ئەستێرەکانیان کردبوو. بیری لەو هەموو ڕێگەیە کردەوە، کە گەشتی پێیاندا کردبوو و سەری لەو ڕێگە سەیرە سوڕمابوو، کە خودا بۆ دۆزینەوەی سامانەکەی بۆیهەڵبژاردبوو. ئەگەر بڕوای بەخەونە دووبارەکەی نەکردبا، ئەوا چاوی بەژنە قەرەجەکە، پاشاکە، دزەکە، یان ... بەخۆی گوت، «ئەوەیان خشتەیەکی درێژە. بەڵام پێشهاتەکان لەناو ڕاڕەوەکەدا نووسرابوونەوە و نەمدەتوانی هەڵەی تێدا بکەم.»

خەوی لێکەوت، کاتێکیش بەئاگا هات، خۆر لەبەرزایی ئاسماندا بوو. لای قەدی چنارەکەوە دەستی بەهەڵکەندنی زەوییەکە کرد.

کوڕەکە بەڕووی ئاسماندا قیژاندی، «ئەی جادووگەری پیر، خۆت هەموو چیرۆکەکەت دەزانی. تەنانەت کەمێک ئاڵتوونیشت

لەپەرستگاکە بۆ بەجێ هێشتم، تا بتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئەم کڵێسەیە. ڕەبەنەکە پێکەنی کاتێ بینی بەفرمێسکەوە گەڕاومەتەوە. باشە نەیدەتوانی پێم بڵێی؟»

لەناو باکەدا گوێی لەدەنگێکبوو گوتی، «نەخێر. گەر پێم بگوتبایت، هەڕەمەکانت نەدەبینی. جوان بوون، وانییە؟»

کوڕەکە خنی و لەسەر هەڵکەندن بەردەوامبوو. لەپاش نیو کاتژمێر، خاکەنازەکەی بەر شتێکی ڕەق کەوت. لەپاش کاتژمێرێ، یەک سینەبەند پارەی ئاڵتوونی ئیسپانی لەبەردەمدا بوو. هەروەها بەردی بەنرخیشی تیابوو، دەمامکی ئاڵتوون، کە بەچەرمی سوور و سپی ڕازێندرابوونەوە، پەیکەری لەزمروت و گەوهەر دروستکراویش لەناویاندا هەبوو. ئەمە ئەنجامی داگیرکاری وڵاتێکی لەبیرکراوە، یەکێک لەئیسپانییە گەشتیارەکانیش نەیتوانیووە بەمنداڵەکانی بڵێ، کە ئەو سامانەی بۆ بەجێ هێشتوون.

کوڕەکە ئوریم و تومیمی لەجانتاکەی دەرهێنا. تەنیا یەکجار ئەو بەردانەی بەکارهێنابوو، بەیانییەک، کە لەناو بازاڕەکەدا بووبوو. هەمیشە ژیان و ڕاڕەوەکەی پێشهاتی تەواویان پیشان داوە.

ئوریم و تومیمی لەسینەبەندەکەدا جێگیرکرد. ئێستا ئەوانیش بەشێک بوون لەسامانەکەی، چونکە یادخەرەوەی پاشایەکی پیر بوون، کە هەرگیز جارێکی تر چاوی پێی نەدەکەوتەوە.

کوڕەکە لەبیری خۆیدا گوتی، ڕاستە؛ ژیان بەخشندەیە لەگەڵ ئەو کەسانەدا، کە دوای چارەنووسی خۆیان دەکەون. ئەوجا بیری کەوتەوە، کە دەبێ لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بڕوات بۆ تاریفە و لەدەیا یەکی سامانەکەی بدات بەژنە قەرەجەکە. لەبیری خۆیدا گوتی، «بەڕاستی قەرەجەکان زرنگن.» ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بێ، کە زۆر گەشت بەجیهاندا دەکەن.







با هەڵیکردەوە. بای مەشرق بوو، ئەو بایەی لەئەفەریقاوە دەهات. نە بۆنی بیابانەکە و نە بۆنی داگیرکارە مووریشەکانی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا. لەجێی ئەوە، ماچ و بۆنێکی بۆ هێنا، کە بەباشی پێی ئاشنابوو — ماچێک، کە زۆر لەدوورەوە هاتبوو، هێواش هێواش، تا لەسەر لێوەکانی نیشتووەتەوە.

کوڕەکە بزەی کرد. ئەوە یەکەمجاربوو فاتیمە ماچی بۆ بنێرێ.

گوتی، «ئەوە هاتم، فاتیمە.»



## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێ |
|---|---|---|---|
| ١ | بنەڕەتەکانی فەلسەفە | حەمید عەزیز | |
| ٢ | کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە (چ٢) | فەرهاد پیربال | |
| ٣ | ڕێبازە ئەدەبییەکان (چ ٢) | فەرهاد پیربال | |
| ٤ | نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥ | ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی (چ٢) | جەعفەر عەلی | |
| ٦ | سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | جەعفەر عەلی | |
| ٧ | مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و... (چ٢) | ئەحمەدی مەلا | |
| ٨ | نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەر |
| ٩ | کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین<br>هیوا ع |
| ١٠ | کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا ن |
| ١١ | فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان |